

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وآله وسلم )

دووەم

# عومەری کوڕی خەتاب

(رضي الله عنه)

ئامادەکردنی: خوبەیب کوردی




KTEBXANAY TWESHW

# زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

## ــ دووەم ــــ

# عومەری کوڕی خەتاب(رضي اللة عنة)

ئامادەکردنی: خوبەیب کوردی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

زۆرجار ئێمەی موسڵمان بەشێکی ژیانمان تەرخان دەکەین بۆ خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی، جاری وا هەیە لە بەشێکی ژیاننامەکەدا بەسەرهاتێك کارمان تێدەکات و هەوڵ دەدەین لە ژیانماندا بیکەینە چرایەك بۆ ڕووناککردنەوەی بەرپێمان، چونکە مرۆڤ زووتر لەگەڵ ڕووداوە واقعیەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا زیاتر کاریگەر دەبێت،

ئەم زنجیرەیە بەم مەبەستە نووسراوە، چۆن هاوەڵان بناسین و دیوەجوان و ڕازاوەکانی ناو ژیانی هاوەڵان شارەزابین و بتوانین پەند و وانەیان لێ وەربگرین و لە واقیعی ژیانماندا جێبەجێ بکەین.

ئەم شێوازی فێربوون و فێرکردنە لە قورئانەوە فێر دەبین، کاتێك خوای گەورە پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران، دەفەرموویێت: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾يوسف. (سوێند بەخوا لەداستان و سەرگوزەشتەی یوسف و براکانیدا، گەلێ عیبرەت و ئامۆژگاریی مەزن هەیە، بۆ خەڵکانی هۆشمەندو ژیر کە بیکەنە ڕێ نیشاندەری خۆیان، بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاستی، دیارە کتێبێکی وەکو ئەم قورئانەش، هەرگیز ناشێ قسەوباسێکی هەڵبەستراو بێت، بەڵکو تەصدیق وپشتڕاستکردنەوەیە بۆ کتێبە پێشووەکانی بەرلەخۆی و شیکەرەوەی هەموو شتێکیشە، بەتەواوی بەیانی حەڵاڵ و حەرامی تێدایە و ڕێ نیشاندان و ڕەحمەت و میهرەبانی خوایە بۆ خەڵکێ بیەوێ باوەڕ بهێنێت).

بەویستی الله تعالی درێژە بەم زنجیرەیە دەدەین و هەولدەدین ژیانی زۆربەی هاوەلان بلاو بکەینەوە بە چەند مەبەستێك:

یەکەم: بزانین کەسانێك توانییان خوا لە خۆیان ڕازیی بکەن، چۆن ژیان و چۆن توانییان ئەو ڕەزامەندییە بەدەست بهێنن.

دووەم: تێبگەین ئەزموونی پەیڕەوی پەیامی خوا ناواقیعی نیە و تەنها لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سنووردار نەبووە، بەڵکو ئەم دینە واقیعیە و دەکرێت مرۆڤەکان پەیڕەوی بکەن، نموونەی یەکەمیشی لە هاوەڵاندا خۆی دەبینێتەوە.

سێیەم: کۆی ئەم دینەی ئێستا ئێمەی موسڵمان پێوەی پابەندین، لەلایەن هاوەڵانەوە بەدەستمان گەیشتووە، گرنگە شتێك لەبارەی ژیان و بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیانەوە شارەزا ببین، بزانین ئایا ئەم پەیامەمان لە کەسانی سەرڕاست و ژیرەوە وەرگرتووە؟ یان تەمەنێکە لەخشتەبراوین و بە ناحەق پابەندی ئایینێك کراوین کە کەسانێك بە ویستی خۆیان دایانڕشتووەو سەپاندوویانە.

لەم نووسینەدا، تەنها چەند نموونەیەکمان وەرگرتووە، خوێنەری ئازیز دەتوانێت لەم نموونانەوە بەرچاوڕوونییەکی زیاتری هەبێت و خۆی بەدوای دەیان ناونیشان و سەرەباسی تردا بگەڕێت بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی سوودیان لێ وەربگرێت.

ئەم نووسینە لەلایەکەوە هەوڵێکە بۆ دانەوەی مشتێك لە کۆگایەکی قەرزاریمان لە ئاست هاوەڵان، هیوایەکیشە بۆ پێشەنگیکردن بە کەسانێکەوە کە بە دەقی قورئان خوای گەورە ڕازیبوونی خۆی بۆیان نیشان داوە، ئاواتێکە بۆ سەرهەڵدانەوەی نەوەیەکی نوێی موسڵمان کە بتوانن جارێکی دی پەیامی خوا لە دڵ و واقیع و خاکی سەرزەویدا پیادە بکەن.

# عومەری کوڕی خەتاب کێیە؟

ناوی عومەری کوڕی خەتابی کوڕی نوفەیلی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی ریاحی قورەیشی عەدویە، کونیەکەی ئەبووحەفصە، دایکی ناوی حەنتەمەی کچی هاشمی کوڕی موغیرەیە.

عومەر بە فاوورقیش ناسراوە، چونکە کاتێك موسڵمان بوو ئیتر بێباوەڕان نەیاندەوێرا وەك جاران ئازاری موسڵمانان بدەن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ناوی نا فارووق. سەبارەت بە لەدایکبونی هاتووە سی و چوار ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لە دایك بووە، یان دەوترێت سیانزە ساڵ پاش ساڵی فیل لەدایك بووە، بەپێی رای یەکەم عومەری کوڕی خەتاب تەمەنی شەش ساڵ لە پێغەمبەر ﷺ بچووکتر بووە. عومەر کەسێکی باڵابەرزی بەخۆ بوو، رەنگی سوور بوو، رایەکیش دەڵێت سەرەتا عومەر سپی رەنگ بووە، بەڵام دواتر کە لە سەردەمی خیلافەتەکەیدا وشکەساڵی روویدا هێندە خۆی گرتەوە لە خواردن کە رەنگی تێکچوو. عومەر برایەکی ناوی زەیدی کوڕی خەطاب بوو لە

ڕێی باوکیەوە، دایکی ناوی ئەسمائی کچی وەهب بوو، ئەم هاوەڵە لە کۆچەران بوو، زەید براگەورەی عومەر بوو، پێش عومەری برایشی موسڵمان بوو، جا کە زەید لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو عومەری برای دەیوت زەید لە هەردوو چاکەکەدا پێش من کەوت، پێش من موسڵمان بوو، پێش منیش شەهید بوو.

یەکێك لە هاوسەرەکانی عومەر ناوی زەینەبی کچی مەظعوونی کوڕی حەبیبە بوو، زەینەب هاوسەری عومەری کوڕی خەططابە، دایکی عەبدوڵای کوڕی عومەر و حەفصەی کچی عومەرە کە دایکی باوەڕداران و هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بوو ئەم ئافرەتە لەگەڵ عومەری کوڕی خەتابدا کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوەش هاتووە گوایە پێش کۆچکردن بۆ مەدینە مردبێت ڕاست نیە.

لە ساڵی حەوتی کۆچیدا عومەر جەمیلەی بەهاوسەر گرت و عاصمی لێ بوو، دواتر تەڵاقی دا، ئینجا یەزیدی کوڕی حارث بەهاوسەری گرت و عەبدوڕەحمانی لێ بوو.

جەمیلە کاتێك هاوسەری عومەر بوو هێشتا ناوی عاصیە بوو وتی عومەر رقمە لە ناوەکەی خۆم ناوێکی ترم لێ بنێ، ئەویش ناوی نا جەمیلە، ئەویش توورە بوو و وتی هیچت بۆ نەدۆزیمەوە جگە لە ناوی کەنیزەیەك؟ بۆیە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ رقم لە ناوەکەمە ناوێکی ترم لێ بنێ، ئەویش ناوی نا جەمیلە، بەڵام ئەو توورە بوو و وتی کە پێشتریش عومەر وا ناوی ناوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (أما علمت أن الله عند لسان عمر و قلبه)، (مەگەر نازانیت خوا لەگەڵ زمان و دڵی عومەرە؟).

ژنێکی تری عومەر ناوی ئوموکلثومی کچی عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوو، کچەزای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، عومەری کوڕی خەططاب بەهاوسەری گرت، ئەوەشی بۆیە کرد تا پشکێ لە رەچەڵەکی پێغەمبەری خوای ﷺ بەرکەوێت.

عاتیکەی کچی زەید کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو، عاتیکە سەرەتا ژنی عەبدوڵای کوڕی ئەبووبەکر بوو، واتە ژنی ژنبراکەی زوبەیر بوو،

ئەوەبوو عەبدوڵا شەهید بوو، دواتر شووی کرد عومەری کوڕی خەتاب هێنای و ئەویش شەهید بوو، دواتر زوبەیری کوڕی عەووام هێنای و ئەویش شەهید بوو، ئیتر خەڵکی دەیانوت کێ دەیەوێت شەهید بێت با عاتیکە بە هاوسەر بگرێت.

## منداڵەکانی:

عەبدوڵا و عەبدوڕەحمان و حەفصە کە دایکیان زەینەبی کچی مەظعوون بوو، زەید و روقییە کە دایکیان ئومموکلثومی کچی عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوو، زەیدی بچووك و عوبەیدوڵا کە دایکیان ناوی ئومموکلثومی کچی جەروەل بوو، عەبدوڕەحمان کە دایکی ئوممووەلەد بوو، عەبدوڕەحمانی بچووك کە دایکی ئوممووەلەد بوو، فاطیمە کە دایکی ناوی ئوموحەکیم بوو، زەینەب کە دایکی ناوی فکیهە بوو.

عەبدوڵای کوڕی عومەر یەکێك بوو لە هاوەڵە گەورە و زاناکانی ناو هاوەڵان کە لە پیتی (ع) دا باسی ژیانەکەیان کردووە، ئەم هاوەڵە فەرموودەیەکی زۆری لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە و دیارترین منداڵی عومەری کوڕی خەتابە.

## عومەر پێش موسڵمانبوونی:

عومەر ماڵی لە مەککە بوو و لە لاپاڵی شاخێکەوە خانووی کردبوویەوە کە لە سەردەمی نەفامیدا بەو شاخە دەوترا عاقیر و دواتر ناوی نرا کێوی عومەر، عومەر لە مەککە مەڕو ماڵاتی خەتابی باوکی دەلەوەڕاند، باوکیشی زۆر لەگەڵیدا توند بوو و کەسێکی تووڕە بوو.

دواتر عومەری کوڕی خەططاب نێردراوی قورەیش بوو بۆ شوێنان و ئەو ئەرکەی پێ سپێردرابوو.

عومەری کوڕی خەططاب پێش موسڵمانبوونی دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بوو، سەعیدی زاوای عومەر لەلایەن عومەرەوە لەسەر ئیسلام ئازارو ئەشکەنجەی دەچەشت، خۆی دەڵێت عومەر پێش ئەوەی موسڵمان بێت لەسەر موسڵمان بوونم من و خوشکەکەشی دەبەستەوە.

## موسڵمانبوونی:

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە عومەر لە ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتی و لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدا موسڵمان بوو.

جارێك عومەر هەواڵی بیست کە پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێکەو هاوەڵان لە دەوری خڕ بون، بڕیاری دا بچێت و بیکوژێت، لە ڕێدا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵا گەیشت بە عومەر و وتی عومەر بۆ کوێ دەچیت؟

ئەویش وتی دەچم بۆ موحەممەد کە باری قوڕەیشی پەرت کردووەو هەرزەکارەکانی لەرێ لاداوەو تانە لە دینی قوڕەیش دەدات و قسە بە

خواکانی قورەیش دەڵێت، دەچم و دەیکوژم، ئەویش وتی بەخوا عومەر خۆت لێ گۆڕاوە، بۆ وادەزانیت دوای کوشتنی موحەممەد بەنی عەبدمەناف ئیتر دەهێڵن پێ بخەیتە سەرزەوی؟

بۆ وریای خانەوادەی خۆت نیت؟ ئەویش وتی مەبەستت کامیانە؟ نوعەیم وتی سەعیدی زاواو ئامۆزات و فاطیمەی خوشکت کە موسڵمان بوون و شوێن موحەممەد کەوتون، بڕۆ وریای ئەوان بە، عومەریش خێرا گەڕایەوەو رووەو ماڵی خوشکەکەی چوو.

خەبابی کوڕی ئەرەت دەچوو بۆ ماڵی فاطیمەی خوشکی عومەری کوڕی خەططاب کە لەگەڵ سەعیدی کوڕی زەیدی مێردی موسڵمان بووبوون، خەبباب لەوێ قورئانی فێری فاطیمەو مێردەکەی دەکرد، رۆژێك عومەری کوڕی خەتاب کە هێشتا موسڵمان نەبووبوو چوو بۆ ماڵی فاطیمەی خوشکی کاتێك بیستبووی خوشکەکەی موسڵمان بووە، کە نزیك بوویەوە گوێی لە قورئان خوێندنەکەی خەبباب بوو، کە چوویە ژوورەوە دای لە فاتیمەی خوشکی و خوێن لە دەموچاوی هات،

عومەر کە ئەوەی بینی پەشیمان بوویەوە، پاشان داوای کرد ئەو قورئانەی دەیانخوێند بیدەنە دەستی، فاطیمە وتی تا خۆت نەشۆیت نایدەمە دەستت، عومەر خۆی شۆرد و قورئانەکەی وەرگرت و خوێندیەوە، وتی وتەکانی چەند جوانن، خەبباب کە ئەمەی بیست خێرا وتی ئەی عومەر سوێند بەخوا هیوانم هەیە خوای گەورە نزای پێغەمبەری بۆ گیرا کردبیت، چونکە من دوێنێ شەو گوێم لێ بوو نزای دەکرد و فەرمووی: خوایە بە موسڵمانبوونی ئەبولحەکەمی کوڕی هیشام یان بە موسڵمان بوونی عومەری کوڕی خەططاب پاڵپشتی ئیسلام بکە(ئیسلام سەربخە)، دەی عومەر دەرفەتە لەدەستی مەدە، عومەریش وتی ئەی خەبباب دەی بمبە بۆ لای موحەممەد تا موسڵمان بم، خەببابیش پێی وت پێغەمبەر ﷺ لە کوێیە، عومەریش چوو و موسڵمان بوو.

کە عومەر گەیشتە لای ماڵی ئەرقەم، یەکێك لە هاوەڵان لە درزی دەرگاکەوە سەیری کرد عومەرەو شمشێرێکی بە دەستەوەیەو وەستاوە،

بە ترسەوە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە عومەرەو شمشێرێکی بە دەستەوەیە، حەمزەش هەستا و وتی ئەگەر خێری پێیە باشە، ئەگەریش نیازی خراپ بێت بە شمشێرەکەی خۆی دەیکوژین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی مۆڵەتی بدە بێتە ژوورەوە، کەسێك هەستاو دەرگای بۆ کردەوەو پێغەمبەر ﷺ هەستا و چوو بەرەو پیری، فەرمووی کوڕی خەططاب بۆچی هاتویت؟ دەڵێیت واز ناهێنیت تا خوا نەتخاتە بەر هەورە بروسکە، عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوم تا باوەڕ بهێنم بە خوا و پێغەمبەرەکەی و ئەوەی لای خواوە هاتووە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ تەکبیرێکی کرد و موسڵمانانیش زانییان عومەر موسڵمان بووە.

نزاکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ عومەر لە ڕۆژی چوارشەممەدا بوو، ئەوەبوو ڕۆژی پێنج شەممە عومەر موسڵمان بوو، کە موسڵمان بوو لەلایەن موسڵمانانەوە الله اكبرێك کرا کە لە مەککە دەنگی دایەوە، ئینجا عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تا کەی ئیمانمان بشارینەوە

لەکاتێکدا ئێمە لەسەر حەقین و ئەوان ناحەقن، ئەویش فەرمووی (ئەی عومەر ئێمە کەمین و دەشزانیت تووشی چی بوین)، عومەر وتی سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە چی کۆڕێ بە بێباوەڕی تیایدا دانیشتبم دەچم و لەوێدا ئیمانی خۆم ئاشکرا دەکەم.

کاتێك عومەری کوڕی خەتاب موسڵمان بوو، پرسیاری کرد چ کەسێك لەناو قورەیشدا زۆر قسە ئاشکرا دەکات؟ پێی وترا جەمیلی کوڕی مەعمەر، عومەریش چوو بۆ لای و هەواڵی پێدا کە موسڵمان بووە و پێی وت بەڵام تکام وایە لای کەس باسی نەکەیت و بیشاریتەوە، جەمیلیش تا توانی لەناو خەڵکدا هاواری کرد کە عومەر وازی لە ئایینەکەی هێنا.

ئەبووجەهل گەیشت بە عومەر دوای ئەوەی عومەر تەوافی کردبوو، وتی فلآنەکەس دەڵێت وازت لە دینەکەت هێناوە، عومەریش بەبەرچاویەوە شایەتومانی ئیسلامی وتەوە، موسڵمانان کەوتنە لێدانی

و ئەویش کەوتە لێدانی عوتبە، عوتبە هاواری دەکرد و خەڵکەکەش کەناریان گرت، خەڵکەکە چاریان نەکرد و کەناریان گرت.

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێت کە عومەر موسڵمان بوو وتی کێ زۆر قسە دەگێڕێتەوە، پێی وترا جەمیلی کوڕی مەعمەری جومەحی، دەمەو بەیان بوو کە چوو بۆ لای، منیش بەدوایدا چووم و تەماشام دەکرد بزانم چی دەکات، کە گەیشتە لای جەمیل وتی ئەی جەمیل ئەرێ زانیوتە من موسڵمان بووم و چوومەتە ناو ئایینی موحەممەدەوە؟

عەبدوڵا دەڵێت سوێند بەخوا جەمیل هەرکە ئەوەی بیست هەستا و عەباکەی بەدوایدا دەخشا و عومەریش بەدوایدا دەڕۆیشت و منیش بەدوایاندا چووم، جەمیل گەیشتە لای دەرگای کەعبە، قوڕەیشیەکانیش لە کۆڕ و مەجلیسیاندا دانیشتبوون، جەمیل تا توانی هاواری کرد ئەی خەڵکینە کوڕی خەتاب لەدین دەرچوو، عومەریش لە پشتیەوە دەیوت درۆ دەکات بەڵکو من موسڵمان بووم و شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوا و موحەممەدیش پێغەمبەری

خوایە ﷺ خێرا قورەیشیەکان بەڕوویدا راپەڕین و عومەریش بەرگری لەخۆی دەکرد و بەرامبەریان وەستایەوە... کابرایەك هات و وتی ئەوە چیە؟

وتیان عومەر لە دین هەڵگەڕاوەتەوە، ئەویش وتی وازبێنن کابرا شتێکی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو دەستی لێ هەڵبگرن، بۆ وادەزانن بەنی عەددی هەروا وازتان لێدێنن چیتان دەوێت بەرامبەر عومەر بیکەن؟ ئیتر ئەوانیش وازیان لێهێنا.

ئیبن مەسعوود دەڵێت بە موسڵمانبوونی عومەر شکۆیەکمان پەیدا کرد.

## کۆچکردن بۆ مەدینە:

کاتێك موسڵمانان کۆچیان دەکرد بۆ مەدینە، عومەریش بڕیاری کۆچی دا، ئەوەبو هاودەم بە عەییاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە کۆچی کرد، عومەر دەڵێت کاتێك ویستم هاودەم بە عەییاشی کوڕی ڕەبیعەو هیشامی کوڕی عاص ویستم کۆچ بکەم، وادەمان داناو وتمان هەرکەس دواکەوت ئەوە ڕێی لێگیراوەو ئەوانی تر بڕۆن، بۆ بەیانیەکەی من و عەییاش گەیشتین و هیشام ڕێی لێگیرا، بۆیە کەوتینەڕێ، کە گەیشتینە مەدینە لای بەنی عەمری کوڕی عەوفماینەوە، ئەبووجەهل و حارثی کوڕی هیشام کە ئامۆزای عەییاش بوون و لە ڕێی دایکیشەوە برای بوون، هاتن بۆ مەدینەو وتیان ئەی عەیاش دایکت نەزری کردووە شانە نەدات لە سەری و لەبەر خۆردا بمێنێتەوە تا تۆ دەبینێت، منیش زۆر هەوڵم دا بە قسەکانیان لەخشتە نەچێت و نەڕواتەوە، تەنانەت تۆ دەزانیت من زۆر دەوڵەمەندم، نیوەی سامانم بۆ تۆ بەڵام لەگەڵیان مەگەڕێرەوە، بەڵام عەییاش خۆی پێ ڕانەگیرا،

منیش وتم هەر دەگەڕێیتەوە دەی ئەو وشترەی من ببە و زانیت فێڵت لێ دەکەن خۆت رزگار بکەو وەرەوە، ئەویش وشترەکەی برد و چوو، لە نیوەی رێدا ئەبووجەهل پێی وت براکەم وشترەکەم نارِوات، بەڵکو لە دوای تۆوە سەرکەوم، بەو فێڵە گرتیان و بەستیانەوەو بردیانەوە بۆ مەککە.

هەریەك لە عومەری کوڕی خەتاب و زەیدی برایشی کە کۆچیان کرد بۆ مەدینە لای ریفاعە دابەزین و لەوێ مانەوە.

دواتر پێغەمبەر ﷺ کە برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان عومەری کوڕی خەتاب و عوتبانی کوڕی مالیکەوە.

## خەو بینینی عومەر بۆ بانگدان

موسڵمانان سەرەتا بانگیان نەبوو، جا بۆ شتێك دەگەڕان تا خەڵکی پێ کۆبکەنەوە بۆ نوێژ، ئەوەبوو چەند هاوەڵێك خەویان بینی کە لە خەوەکەیاندا بانگیان فێر کرا، لەوانەش عومەری کوڕی خەططاب، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا بانگ دابنرێت بۆ بانگهێشتی خەڵك بۆ نوێژەکان.

عەبدوڵای کوڕی زەیدی کوڕی عەبد رەببیە لە خەودا بانگی پێ وترا، عەبدوڵا هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمشەو لەخەومدا کەسێك کە دوو جلی سەوزی لەبەربوو و زەنگێکی بەدەستەوە بوو، وتم ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگە دەفرۆشیت؟

وتی بۆ چیتە؟

وتم تا خەڵکی پێ بانگ بکەین بۆ نوێژ، ئەویش وتی ئایا لەوە چاکترت پێ نیشان بدەم؟

وتم ئەوە چیە؟ وتی بڵێ:

الله أكبر الله أكبر

الله أكبر  الله أكبر

أشهد أن لا إله إلا الله

أشهد أن لا إله إلا الله

أشهد أن محمدا رسول الله

أشهد أن محمدا رسول الله

حي على الصلاة

حي على الصلاة

حي على الفلاح

حي على الفلاح

الله أكبر الله أكبر

لا إله إلا الله

دواتر کەمێك وەستا و پاشان هەمان شتی وت بەڵام بە تاك هەمووی وت، بەڵام لە کۆتاییدا وتی: قد قامت الصلاة قد قامت الصلاة

الله أكبر الله أكبر

لا إله إلا الله

کاتێك ئەو خەوەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پشت بە خوا ئەو خەوە راستە، دەی هەستە بیڵێ بە بیلال چونکە ئەو دەنگی لە تۆ بەرزتر و باشترە، کاتێك بیلال هەستا ئەو بانگەی دەدا عومەری کوڕی خەططاب لە ماڵەوە بوو ئەوەی بیست، خێرا هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و عەباکەی رادەکێشا و دەیوت ئەی

پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە من هەمان ئەم خەوەم بینی کە –عەبدوڵا- بینیویەتی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (فلله الحمد فذاك أثبت)، (سوپاس بۆ خوا، دەی ئەوە چەسپاوترە).

## غەزای بەدر

کاتێك پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ بەدر، پێش غەزاکە رای خەڵکی وەرگرت و فەرمووی راتان چیە؟ ئەبووبەکری صدیق وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ بیستوومانە ئەوان-قورەیش لە فلاّنە شوێنن، دواتر پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکەکەی فەرموو راتان چیە؟ ئەمجار عومەری کوڕی خەططاب هەمان قسەی ئەبووبەکری کرد.

پێش ئەوەی جەنگی بەدر روودات، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو هەرکەس عەبباسی بینی نەیکوژێت چونکە بە نابەدڵی دەرچووە، ئەبووحوذەیفە وتی یانی باوك و کوڕ و برای خۆمان بکوژین

و عەبباس نەکوژین؟! بەخوا بگەم پێی بە شمشێر پارچە پارچەی دەکەم، پێغەمبەر ﷺ کە ئەوەی بیستەوە، بە عومەری فەرموو (ئەی ئەبووحەفص رەوایە بە شمشێر بدرێت لە دەموچاوی مامی پێغەمبەری خوا؟)، عومەر وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتم بدە بە شمشێر بدەم لە گەردنی ئەو کابرایە، ئەوە موافیق بووە، بەڵام ئەبووحوذەیفە پەشیمان بوو لەو قسەی دەیکرد و دواتریش هەمیشە دەیوت هیچ کات دڵنیا نیم لەو قسەی ئەو رۆژە کردم و هیوام وایە تەنها شەهیدبوونم ئەو تاوانەم لەسەر بسڕێتەوە.

کە دواتر موسڵمانان سەرکەوتن و نزیکەی حەفتا کەسیان بەدیل گرت، پێغەمبەر ﷺ رای ئەبووبەکر و عومەری وەرگرت سەبارەت بە دیلەکان، ئەبووبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە لە هۆزی خۆت و ئامۆزایانی خۆتن، پێم وایە بە لەبریتی ئازادیان بکەیت، بەوە ئەو دەستکەوتە دەبێت بە هێز بۆ ئێمە دژ بە بێباوەڕان، بەڵکو خوای گەورەش رێنموونیان بکات بۆ ئیسلام، بەڵام عومەر وتی نابەخوا ئەی

پێغەمبەری خوا ﷺ من ڕاکەی ئەبووبەکرم نیەو پێم وایە بدەین لە گەردنیان، عەلی عەقیل بگرێت و بدات لە گەردنی، منیش فلاّنە خزمی خۆم بگرم و بدەم لە گەردنی، ئەوانە ڕێبەرانی کوفرن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕاکەی ئەبووبەکری بەدڵ بوو، بۆ بەیانیەکەی عومەر چوو دەبینێت پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکر دانیشتون و دەگرین، عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی دەگرین؟ با ئەگەر کرا منیش بگریم و ئەگەریش گریانم بۆ نەهات بۆ گریانەکەی ئێوە بگریم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (بۆ ئەوە دەگریم کە هاوەڵەکانت وتیان با لەبریتی وەربگرین لێیان، لە خواروی ئەو درەختەوە-درەختێکی نزیك لە پێغەمبەر ﷺ بوو- سزای ئەوانەم بۆ خرایەڕوو-) ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە(ما كان لنبی أن يكون له أسرى...).

سوهەیلی کوڕی عەمر لە غەزای بەدردا دژ بە موسڵمانان بەشداری کرد و بەدیل گیرا، عومەر داوای دەرفەتی لە پێغەمبەر ﷺ کرد تا بیکوژێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (وازی لێ بهێنە ئەی عومەر، لەوانەیە لە شوێن و بارێکدا ببینیت لەسەر ئەو بارەی سوپاسی بکەیت).

# غەزای ئوحود

لە غەزای ئوحوددا هەریەك لە عومەر و زەید پێکەوە بەشداری غەزاکە بوون، لە گەرمەی جەنگەکەدا بوون کە عومەر قەڵغانەکەی خۆی دا بە زەید و وتی براگیان ئەم قەڵغانە بگرە، زەیدیش وتی منیش هەمان ئەو شەهیدیەم دەوێت کە تۆ دەتەوێت، بۆیە هیچکامیان قەڵغانەکەیان بەکارنەهێنا.

کاتێك موسڵمانان لە دەوری پێغەمبەر ﷺ بڵاوەیان کرد، یەکێك لەوانەی لە دەوری پێغەمبەر ﷺ مایەوە عومەری کوڕی خەتاب بوو، کەوتنە دوورخستنەوەی بێباوەڕان تا گەیشتنە بەرزایی شاخەکە.

کاتێك موسڵمانان شکان و پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانێك چوونە بەرزایی شاخەکەوە، ئەبووسوفیان هاواری دەکرد ئەرێ موحەممەد لەنێوتاندایە؟ سێ جار ئەو هاوارەی کرد، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو کەس وەڵامی نەداتەوە، دواتر وتی ئەری کوڕەکەی ئەبی قوحافەتان

لەنێودایە؟ سێ جار ئەوەشی وت و کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان سێ جار وتی ئەرێ کوڕەکەی خەططابتان لەنێودایە؟ ئینجا چوویەوە بۆ لای هاوەڵەکانی و وتی ئەوانە هەموویان کوژراون، ئیتر عومەر خۆی پێ نەگیرا و وتی ئەی دوژمنی خوا بەخوا درۆ دەکەیت، ئەوانەی ناوت بردن هەموویان زیندوون، ئەوەی تۆ پێی دڵگرانیت ماوە، ئەبووسوفیان وتی رۆژ بە رۆژە، ئەمڕۆلەبری بەدر، جەنگ نۆرەیە، پاشان هاواری دەکرد پایەدار بێت هوبەل، پایەدار بێت هوبەل،

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بۆوەڵامی نادەنەوە؟ وتیان چی بڵێین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بڵێن (خوا پایەدارترە)، ئەویش وتی ئێمە عوززامان هەیەو ئێوە نیتانە، پغەمبەر ﷺ فەرمووی بۆ وەڵامی نادەنەوە؟ وتیان چی بڵێین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بڵێن (خوا پشت و پەنامانەو ئێوە هیچ پشت و پەنایەکتان نیە).

لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا عومەری کوڕی خەتاب حەفصەی کچی مارە کرد لە پێغەمبەر ﷺ.

کاتێك حەفصە بێوەژن کەوت، عومەری باوکی بڕیاری دا مێردێکی باش بدۆزێتەوە بۆ کچەکەی، بۆیە پێشنیازی کرد بۆ ئەبووبەکر تا بەهاوسەری بگرێت، بەڵام ئەبووبەکر ڕەزامەندی دەرنەبڕی، ئینجا پێشنیازی کرد بۆ عومەر، ئەویش ڕەزامەندی دەرنەبڕی و وتی بڕوام نیە بتوانم ئەم ماوە ژن بهێنم، عومەریش بەوە دڵتەنگ بوو و جۆرێك لە بێتاقەتی ڕوی تێکرد و چوو لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵای کرد کە چی ڕوویداوە، ئەویش فەرمووی (يتزوج حفصة من هو خير من عثمان و يتزوج عثمان من هي خير من حفصة)، (کەسی باشتر لە عوثمان حەفصە بەهاوسەر دەگرێت و عوثمانیش کەسی باشتر لە حەفصە بەهاوسەر دەگرێت)، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ داوای حەفصەی کرد و بەهاوسەری گرت، دواتر کە ئەبووبەکر عومەری بینی وتی دڵت شتێك نەکات بەرامبەرم، من بیستبووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی حەفصەی دەکرد، بۆیە –ئەمەشم پێ نەوتیت- وتم با نهێنی پێغەمبەر ﷺ ئاشکرا نەکەم، بە دڵنیاییشەوە پێغەمبەر ﷺ حەفصەی بەهاوسەر نەگرتایە من داوام دەکرد و بەهاوسەرم دەگرت.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستی حەفصەی کچی عومەر تەڵاق بدات، عومەر هەڵوێستێکی ورد و ژیرانەی نواند.

عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت من و دراوسێیەکی پشتیوانیم کە لە سەرووی شاری مەدینەوە بووین هەر ڕۆژەو یەکێکمان دادەبەزی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئیتر ئەوەمان دەچوو هەواڵی سروش و پێغەمبەری خوای ﷺ دەهێنا بۆ ئەوی ترمان، جارێك کە سەرەی پشتیوانیەکە بوو، گەڕایەوەو بە توندی دای لە دەرگا و منیش تەواو ترسام، وتی شتێکی گەورە ڕوویداوە، مەسەلەکەی بۆ باس کرد، منیش چووم بۆ لای حەفصەو بینیم دەگری، وتم ئایا پێغەمبەر ﷺ تەڵاقی داون؟ ئەویش وتی نازانم، ئینجا چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و هەر بە پێوە وەستابووم وتم ئایا ژنەکانت تەڵاق داون؟ ئەویش فەرمووی نا، منیش وتم الله أکبر.

جیا لەو رووداوە پێغەمبەر ﷺ تەڵاقێکی حەفصەی دا، دواتر گێڕایەوە بۆ لای خۆی، چونکە جبرەئیل هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموو (راجع حفصة، فإنها صوامة قوامة، و إنها زوجتك في الجنة)، (حەفصە بگێڕەوە، چونکە ئەو زۆر رۆژووگر و زۆر شەونوێژکەرە، هەروەها ئەو هاوسەرت دەبێت لە بەهەشتدا).

کاتێك حەفصە تەڵاق درابوو، عومەر چوو بۆ لای و بینی حەفصە دەگری، وتی بۆچی دەگریت؟ لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەلاقی داویت؟

ئەو تەلاقی داویت و لەبەر من دەتگێڕێتەوە، دە بەخوا ئەگەر جارێکی تر تەلاقت بدات هەرگیزاو هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.

حەفصە دەڵێت رۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەماڵەوە بوو و جلەکەی خستبووە نێوان رانەکانی، ئەوەبوو ئەبووبەکر هات و داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتی پێدراو هاتە ژوورەوە، پێغەمبەر ﷺ هەروەك خۆی

مایەوەو خۆی تێکنەدا، ئینجا عومەریش هات و هەمان شت روویدا، ئینجا عەلی هات و هەمان شت روویدا، ئینجا هاوەڵانێکی تر هاتن و پێغەمبەر ﷺ هیچ خۆی تێکنەدا و هەر لەو شێوەی خۆیدا مایەوە، ئینجا عوثمان هات و داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی پێدرا تا بێتەژوورەوە، خێرا پێغەمبەر ﷺ جلەکانی رێککرد، ئینجا کەوتنە قسەکردن و پاش ماوەیەك خەڵکەکە چوون، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبووبەکر و عومەری و عەلی و ئەو هاوەڵانەی تر هاتن تۆ هیچ خۆت تێکنەدا، کەچی کە عوثمان هات خێرا خۆت کۆکردەوەو جلەکانت رێککرد، ئەویش فەرمووی: (ألا أستحيي ممن تستحيي منه الملائكة)، (ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك کە فریشتە شەرمی لێ دەکات)

# غەزای خەندەق

عومەر لە غەزای خەندەقیشدا بەشداری کرد، سەرقاڵبوونی بە ڕێگرتن لە هاتنەناوەوەی بێباوەڕان زۆر سەرقاڵی کرد، بۆیە هاتە ژوورەوەو خۆر ئاوا بووبوو، کەوتە قسەوتن بە بێباوەڕانی قورەیش و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من نوێژم دەکرد تا خۆر ئاوا بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی منیش هێشتا نوێژی عەسرم نەکردووە.

دوای ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ هێرشی بەنی قورەیضە، عومەریش بەشداری تێدا کرد، تیایدا سەعدی کوڕی موعاذ بریندار بوو، کاتێك پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای سەعدی کوڕی موعاذ، پێغەمبەر ﷺ باوەشی پێدا کرد و خوێن بەسەر پێغەمبەردا ﷺ دەچۆڕا، کە ئەبووبەکر هات و ئەوەی بینی وتی وەی پشتی شکاوم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی وس ئەی ئەبووبەکر، دواتر عومەر هات کە ئەو بارەی بینی وتی إنا لله و إنا إلیه راجعون.

## ڕێککەوتنی حودەیبییە

هەروەها عومەری کوڕی خەتاب لە ڕێککەوتنی حودەیبییەشدا بەشداری کرد، جا کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستی نێردراوێك بنێرێت بۆ ناو قوڕەیش تا پەیامی پێغەمبەری خوایان ﷺ پێ بگەیەنێت کە تەنها بۆ عومرە هاتون، پێشنیازی کرد عومەر بچێت، عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەترسم قوڕەیش بمکوژن چونکە کەس لە بەنی عەددی لە مەککە نەماون بەرگریم لێ بکەن و دەشزانیت قوڕەیش چەندە دژایەتیم دەکەن، بەڵام کەسێکت پێ دەڵێم کە زۆر لە من باشترە بۆ ئەوە، ئەویش عوثمانی کوڕی عەففانە، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ پێشنیازەکەی عومەری وەرگرت و عوثمانی نارد.

دواتریش لە کاتی نووسینی ڕێککەوتنەکەدا عومەر ئامادەیی هەبوو و یەکێك بوو لە شایەتەکان.

لە مانگی شەعبانی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا پێغەمبەر ﷺ سی سواری لەگەڵ عومەری کوڕی خەططابدا نارد بۆ ناوچەی توربە کە چوار میل لە مەککەوە دوور بوو، کە گەیشتنە ئەوێ هەموو رایانکرد، عومەریش گەڕایەوە بۆ مەدینە، جا پێی وترا ئەی بۆ هێرشت نەکردە سەر خەثعەمیەکان، عومەریش وتی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدام تەنها جەنگی هەوەزانیەکان لە خاکی خۆیاندا بکەم.

لە ساڵی هەشتەمی کۆچیشدا پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی بە سەرکردایەتی ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح نارد بۆ ناوچەی (الخبط)و عومەری کوڕی خەططابیش تیایدا بەشدار بوو.

# لە فەتحی مەککەدا

کاتێك قورەیشیەکان پەیمانیان شکاند و پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا هێرش بباتە سەر مەککە و فەتحی بکات، ئەبووسوفیان هات تا رێککەوتنەکە درێژ بکاتەوە، کە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەدایەوە، بۆیە چوو تکای لە ئەبووبەکر و عومەر و عەلی کرد تا لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سکاڵای بۆ بکەن، ئەوەبوو کە چوو بۆ لای عەلی حەسەنی کوڕی عەلی منداڵێك بوو لەبەردەمیدا یاری ئەکرد، عەلیش وەك ئەوانی تر ئەبووسوفیانی بێهیوا کرد و وتی پێغەمبەر بڕیارێکی داوە کە کەسمان بۆی نیە قسەی تێدا بکات.

لە شەوی فەتحی مەککەدا عەبباس بە ئەبووسوفیانی وت ماڵوێران سەرکەوە با بتبەم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و داوای پەنات بۆ بکەم، ئەبووسوفیانیش لە دوای عەبباسەوە سەرکەوت، بەردەوام دەیاندا بە لای ئاگری موسڵماناندا و یەك یەك عەبباس دەستەکانی پێ دەناساند،

کە گەیشتە لای ئاگرەکەی عومەری کوڕی خەتاب، عومەر چوو و ئەبووسوفیانی بینی، وتی ئەبوسوفیان، ئەی دوژمنی خوا، سوپاس بۆ خوا کە بێ بوونی پەنا و بەڵێنێك تۆی خستە بەردەستم، ویستی بیکوژێت کە عەبباس نەیهێشت، عومەر بەوەوە نەوەستا لەگەڵیان چوو تا گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ ، وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە دوژمنەکەی خوا بێ بوونی پەنا و بەڵێنێك کەوتووەتە بەردەستم، دەرفەت بدە تا بدەم لە گەردنی، عەبباس وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ من پەنام داوە، ئینجا عەبباس وتی ئەی عومەر ئیتر بەسە، ئەگەر ئەمە کەسێك بوایە لە بەنی عدی وات نەدەوت، بەڵام دەزانیت لە بەنی عەبدمەنافە وا دەڵێیت، عومەر وتی راوەستە عەبباس، سوێند بەخوا موسڵمانبوونەکەی تۆم لە موسڵمانبوونی خەتاب لا خۆشتر بوو، چونکە دەمزانی موسڵمان بووی تۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە موسڵمانبوونی خەططاب خۆشترە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی عەبباس بیبە بۆ لای خۆت و کە بەیانی هات بیهێنە بۆ لام، بۆ بەیانی عباس ئەبووسوفیانی هێنایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ

فەرمووی ماڵت وێران بێت ئەبووسوفیان ئیتر کاتی نەهاتووە بزانیت هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خودا؟! ئەبووسوفیان وتی بە دایکو باوکمەوە بەقوربانت بم چەندە لەسەرخۆ و خزم دۆست و بەخشندەیت،عەبباسیش وتی ماڵوێران دەی موسڵمان بە پێش ئەوەی بدات لە گەردنت، ئەبووسوفیانیش شایەتومانی هێنا.

زەیدی برای عومەر دەڵێت رۆژی فەتحی مەککە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەرەو گۆڕستانەکان دەرچووین، پێغەمبەری خوا ﷺ لای گۆڕێك دانیشت و دەمانبینی دەتوت قسەی لەگەڵ دەکات، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەستا و فرمێسکی لە چاوانی دەسڕی، عومەری برام پێش هەمووومان پێی گەیشت و پێی وت بەدایك و باوکمەوە بەقوربانت بم بۆچی دەگریت؟ فەرمووی (داوای مۆڵەتم کرد لە پەروەردگارم لە سەردانی گۆڕی دایکم لەبەرئەوەی دایك بووەو مافی بەسەرمەوە هەیە داوام کرد داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم، بەڵام پەروەردگارم رێی پێنەدام)، پاشان پێغەمبەر ﷺ بە ئاماژەیەك پێی راگەیاندین دابنیشین،

ئێمەش دانیشتین، ئینجا فەرمووی (من پێشتر ڕێگریم لێکردبون لە سەردانی گۆڕ، جا –لەمەودوا- هەرکامتان ویستی سەردانی گۆڕ بکات با بیکات،...).دوای فەتحی مەککە خەڵکی کۆبووەوە تا بەیعەت بدەن بە پێغەمبەر ﷺ عومەریش لە خوارووی کۆڕەکەوە بوو و بەیعەتی لە خەڵکەکە وەردەگرت بۆ پێغەمبەر ﷺ.

## بەشداری لە سوپاکەی ئوسامەدا

پێغەمبەر ﷺ لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنیدا بوو، ڕۆژی چوارشەممەکەی تاو نارەحەتی پێغەمبەری خوای ﷺ داگرت، بەڵام ڕۆژی پێنج شەممە خۆی چوو ئاڵاکەی دایە دەست ئوسامەی کوڕی زەید تا هێرش ببەنە سەر ڕۆم، لەنێو سوپاکەیدا ئەبووبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەطاب و ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەراح و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و چەندین هاوەڵی تری گەورە هەبوون، لەسەر

ئەوە کەسانێ نارەزاییان دەربڕی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ تەواو توورەبوو و لەتاو ئازاریش سەری بەستبوو، چوویە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر فەرمووی (پاشان ئەی خەڵکینە ئەو قسەو باسە چیە پێم گەیشتوەتەوە لە هەندێکتان سەبارەت بەوەی ئوسامەم بە ئەمیر داناوە، ئەگەر تانە دەدەن لە ئەمیرایەتی ئوسامە پێشتریش تانەتان دا لەوەی باوکیم بە ئەمیر دانا، ئەرێ بەخوا ئەو کەسە بۆ ئەمیرایەتی دروست کرابووو دوای خۆیشی کوڕەکەشی بۆ ئەمیرایەتی دروست کراوە..

## نزیکی عومەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ

جوانترین بەڵگە بۆ زۆری نزیکی عومەر لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەم وتەی عەلی کوڕی ئەبووطالیبە، کاتێك عومەری کوڕی خەططاب وەفاتی کرد، خەڵکێ نزایان دەکرد بۆ عومەر، عەلی کوڕی ئەبووطالیبیش وتی رەحمەتی خوات لێ بێت، هیوام وایە خوای گەورە لەگەڵ دوو هاوڕێکەت کۆت بکاتەوە-پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکر- چونکە من زۆر جار لە پێغەمبەری خوام ﷺ دەبیست دەیفەرموو من و ئەبووبەکر و عومەر بووین، من و ئەبووبەکر و عومەر وامانکرد، من و ئەبووبەکر و عومەر چووین.

زەیدی کوڕی سەعنە دەڵێت: کاتێك سەیری موحەممەدم کرد، چی ئاماژەو نیشانەی پێغەمبەرایەتی هەبوو لە دەموچاوی موحەممەددا بەدیم کرد، تەنها دوو نیشانە نەبێت، ئەوانیش بریتی بوون لەوەی کە دەبوو لەسەرخۆیی و داناییەکەی پێش نەزانی بکەوێت و نەفامی نواندن بەرامبەری دانایی و نەرمونیانی ئەو زیاتر بکات، منیش

نەرمیم لەگەڵ دەنواند و خۆم لێ نزیك دەكردەوە بۆ ئەوەی تێ:ەڵی بکەم و بزانم ئەو نیشانەی تێدایە، ئەوەبوو جارێك پێغەمبەر ﷺ لە ژوورەکەی دەرچوو و عەلی کوڕی ئەبووطالیبیشی لەگەڵدا بوو، کابرایەکی دەشتەکی هات بۆ لای و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی فلآنە گوند موسڵمان بوون و منیش وتوومە ئەگەر موسڵمان بن بەردەوام رۆزییان بۆ دێت، کەچی لەو کاتەوەی موسڵمان بوون قات و قڕی و نەبوونی رووی تێکردوون و باران نابارێت بۆیان، منیش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەترسم بەو بۆنەیەوە واز لە ئیسلام بهێنن، بەڵکو کەسێك بنێریت فریایان بکەوێت، پێغەمبەریش ﷺ تەماشای کابرایەکی کرد کە لەوێدا بوو وابزانم عومەر بوو، عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی لێ نەماوە، منیش لێی نزیك بوومەوەو وتم ئەی موحەممەد پێت چۆنە بڕێ خورمای باخی فلآنە کەسم لێ بکڕیت تا فلآنە رۆژ ئینجا بەهاکەی وەرگرم لێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نا ئەی کابرای جوولەکە، من بڕێ خورمای دیاریکراوت لێ دەکڕم تا فلآنە کات و ناوی باخی فلآنە کەس نابەم)،

منیش وتم باشە، پێغەمبەر ﷺ خورماکەی لێ کڕیم و ناردی بۆ ئەو خەڵکەو فەرمووی (خێرا بڕۆ بۆ لایان و بەوە فریایان بکەوە)، هێشتا چەند ڕۆژێك مابوو بۆ ماوەکە، دوو یان سێ ڕۆژ مابوو، پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەسپەردەکردنی تەرمی کابرایەکی پشتیوانی هاودەم بە ئەبووبەکرو عومەر و عوثمان ودەستەیەکی تر لە هاوەڵانی دەرچوو، دوای ئەوەی نوێژی لەسەر تەرمەکە کرد، لە دیوارێك نزیك بوویەوەو پاڵی پێوەدایەوە، منیش جلەکانم کۆکردەوەو بە دەموچاوێکی گرژەوە تەماشام دەکرد، دواتر وتم ئەی موحەممەد ئەرێ مافەکەی خۆمم نادەیتەوە؟ من پێشتر تێکەڵی بنەماڵەی ئێوەم کردووەو نەمدیوە ئاوا دەستخەڕۆی کەس بکەن، ئینجا تەماشای عومەری کوڕی خەتتابم کرد بینیم چاوەکانی پڕ بون لە فرمێسك و فرمێسك بەسەر کوڵمیەوەیەتی، بە خیسەیەکەوە تەماشای کردم و وتی ئەی دوژمنی خوا چۆن قسەی وا بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێیت؟ سوێند بەوەی پێغەمبەری خوای ﷺ بە حەق ناردووە ئەگەر لەبەر ئەو نەبوایە بەم شمشێرەم دەمدا لە گەردنت، پێغەمبەریش ﷺ بە هێوری تەماشایەکی

عومەری کرد و فەرمووی: (إنا كنا أحوج إلى غير هذا منك يا عمر، أن تأمرني بحسن الأداء، وتأمره بحسن التباعة، اذهب به يا عمر فاقضه حقه، وزده عشرين صاعا من غيره مكان ما رعته)، (ئەی عومەر ئێمە پێویستمان بە هەڵوێستی تری تۆ هەیە، دەبێت فەرمانم پێبکەیت چاك قەرزەکەم بدەمەوەو فەرمان بەویش بکەیت بە جوانی داوای قەرزەکەی بکاتەوە، ئەی عومەر بیبە و مافەکەی بدەرەوە و بیست صاعیش زیاد لەوەی بدەرێ لەبەرامبەر ئەوەی وا ترساندت)، ئینجا عومەر منی برد و قەرزەکەی دامەوەو بیست صاعیش زیادەی پێدام، منیش وتم ئەو زیادەیە چیە؟ وتی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم تا بەرامبەر بەوەی تۆم ترساند ئەم زیادەت بدەمێ، منیش وتم ئەی عومەر من دەناسیت؟ وتی نا، تۆ کێیت؟ وتم من زەیدی کوڕی سەعنەم، وتی زانا جوولەکەکە؟ وتم بەڵێ، وتی ئە بۆچی وات وت بە پێغەمبەر ﷺ و وا لەگەڵیدا هەڵوێستت نواند؟ وتم ئەی عومەر من چی ئاماژەو نیشانەی پێغەمبەرایەتی هەبوو لە دەموچاوی موحەممەددا بەدیم کرد، تەنها دوو نیشانە مابوو، ئەوانیش بریتی بوون

لەوەی کە دەبوو لەسەرخۆیی و داناییەکەی پێش نەزانی بکەوێت و نەفامی نواندن بەرامبەری دانایی و نەرمونیانی ئەو زیاتر بکات، بۆیە بۆ ئەو دوانە هەوڵمدا تا بزانم ئەوانەشی هەیە؟ دەی عومەر تۆ بەشایەت دەگرم وا من رازیم خوا پەروەردگارمەو ئیسلام ئاییمەو موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەشایەتت دەگرم نیوەی سامانەکەم دەکەم بە خێر بۆ ئوممەتی موحەممەد ﷺ عومەر وتی بڵێ بۆ بەشێك لەو ئوممەتە چونکە فریای هەموو ئەو ئوممەتە ناکەویت، منیش وتم بەشێك لەم ئوممەتە، ئینجا عومەر و زەید پێکەوە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر خوا ﷺ و زەید لە خزمەتیدا شایەتومانی هێنا، ئیتر لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوو و بەشداری چەندین غەزای کرد، دواجار لە غەزای تەبووکدا لە رێی هاتنەوەیاندا کۆچی دوایی کرد.

عومەری کوڕی خەططاب دەڵێت پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە خێرکردن، منیش سامانێکی زۆرم هەبوو، وتم بەخوا ئەمجار پێش ئەبووبەکر دەکەوم، بۆیە کردم بە دووبەشەوەو بەشێکیم برد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ئەی عومەر ئەو سامانە زۆرە؟ ئەی چیت بۆ خێزانەکەت جێهێشتووە؟) وتم نیوەی، ئینجا ئەبووبەکر هات و سامانێکی زۆری هێنا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی ئەبووبەکر ئەو سامانە زۆرە؟ ئەی چیت بۆ خێزانەکەت جێهێشتووە؟) وتی خواو پێغەمبەری خوام بۆ جێهێشتوون.

عومەری کوڕی خەتاب داوای کرد لە پێغەمبەر ﷺ تا رووپۆش بۆ ژنەکانی بەکاربهێنێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ رازی نەبوو، ئەوەبوو شەوێك سەودەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ کە ژنێکی باڵآبەرز بوو چوویە دەرەوە، عومەر وتی ئەی سەودە تۆمان ناسیەوە، ئەوەبوو دوای ئەوە ئایەتی حیجاب دابەزی.

عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ کەناری گرت لە ژنەکانی، چووم بۆ لای حەفصەو وتم پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێیە؟ وتی لە ژوورە بچووکەکەیدایە، منیش چوومە ژوورەوە، دەبینم ڕەباحی خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ لەوێیە و لەبەردەرگای ژوورەکە دانیشتووە، هەردوو قاچی لەسەر قەدی دارخورمایەکی بڕاو رووەو خوار شۆڕ کردبوویەوە، ئەو دارخورمایە پێغەمبەر ﷺ دەچوویە سەری و دادەبەزی، منیش وتم ئەی ڕەباح لای پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتم بۆ وەربگرە، ڕەباحیش سەیرێکی ژوورەکەی کرد و دواتر تەماشای منی کرد و هیچی نەوت، منیش دووبارە وتم ئەی ڕەباح لای پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتێکم بۆ وەربگرە، هەمتر ڕەباح سەیرێکی ژوورەکەی کرد و تەماشایەکی منی کردەوەو هیچ نەوت، ئەمجار بە دەنگی بەرز پێم وت ئەی ڕەباح لای پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتێکم بۆ وەربگرە، چونکە وادەزانم پێغەمبەری خوا ﷺ وایزانیبێت من لەبەر حەفصە هاتوم، بەخوا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ فەرمانم پێ بکات بدەم لە گەردنی حەفصەدەدەم لە گەردنی، لەگەڵ قسەکانیشمدا دەنگم بەرز دەکردەوە، ئەویش

ئاماژەیەکی پێدام سەرکەوەمنیش چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بینیم لەسەر حەسیرێك راکشابوو، چووم و دانیشتم، دەمبینی حەسیرەکە بەسەر جەستەیەوە شوێنەواری جێهێشتبوو، سەیرم کرد کۆگاکەی تەنها نزیکەی مشتێ گەنمی تێدابوو لەگەڵ دارگەڵآیەك کە بۆ خۆشە بەکاردەهات و کونەیەك لەولاوە هەڵواسرابوو، ئیتر چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کوڕی خەططاب بۆچی دەگریت؟ وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نەگریم کە دەبینم حەسیرەکە شوێنەواری لەسەر جەستەت جێهێشتووەو ئەوەش کۆگاکەتە دەبینم هیچی تێدا نیە، لەولاشەوە قەیسەرو کیسرا دەبینم چیان هەیە، تۆش پێغەمبەر و هەڵبژێردراوی خوایت و ئەوەش کۆگاکەتە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی کوڕی خەططاب ئایا رازی نیت رۆژی دوایی بۆ ئێمە بێت و دنیاش بۆ ئەوان بێت؟) وتم بەڵێ رازیم.

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص دەڵێت جارێك عومەر داوای مۆڵەتی کرد بچێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و بڕێك ئافرەتیش لای پێغەمبەر ﷺ بوون وپرسیاریان هەبوو و دەنگیان بەرز دەکردەوەو قەرەباڵغییەکیان نابوویەوە، کە زانییان عومەر دێت بەپەلە کەوتنە خۆکۆکردنەوەو چوونە پشت پەردە، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی عومەری دا بێتەژوورەوەو پێغەمبەر ﷺ پێدەکەنی، عومەر وتی هەموو تەمەنت پێکەنین بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (سەرم لەو ئافرەتانە سوڕما کە لای من بوون، کەدەنگی تۆیان بیست بەپەلە چوونە پشت پەردە)، عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ شیاوتریت تا سامت هەبێت لایان، ئەمانە چ ناحەزێکن بە خۆیان، لە من دەترسن و سام لە پێغەمبەری خوا ناکەنەوە؟ ئافرەتەکان وتیان بەڵێ، تۆ ڕەق و زبرتریت لە پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەری خوایش ﷺ بە عومەری فەرموو (والذي نفسي بيده، ما لقيك الشيطان قط سالكا فجا إلا سلك فجا غير فجك)، (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، شەیتان لە هەررێیەکدا پێت بگات خێرا ڕێگەکەی دەگۆڕێت و ڕێیەکی تر دەگرێتەبەر).

ژنان بۆ مەرگی روقییەی کچی پێغەمبەر ﷺ دەگریان و عومەری کوڕی خەططابیش رێگری دەکرد لێیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی وازبێنە ئەی عومەر، پاشان فەرمووی (إياكن ونعيق الشيطان، فإنه مهما يكون من العين والقلب فمن الرحمة، وما يكون من اللسان واليد فمن الشيطان)، (خۆدوور بگرن لە قیژەی شەیتان، چونکە تا لە چاو و دڵەوە بێت ئەوە لە رەحم و سۆزەوەیە، ئەوەش لە زمان و دەستەوە بێت ئەوە لە شەیتانەوەیە)، فاتیمەی خوشکی لە کەناری گۆڕی روقییەوە بۆ روقییەی خوشکی دەگریا، پێغەمبەری خوایش ﷺ بە لایەکی جلەکەی فرمێسکی چاوانی فاتیمەی دەسڕی.

دوکەین دەڵێت ئێمە نزیکەی چوارسەد کەس دەبووین کە هاتین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و داوای خواردنمان لێکرد، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە دەڵێت چوارسەد و چل کەس دەبووین، پێغەمبەریش ﷺ بە عومەری فەرموو (هەستەو خواردنیان پێ بدە)، عومەر بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو کە کەمە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە پێیان بدات، ئەویش وتی بەسەرچاو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بۆیە هەستا و ئەوانی برد بۆ ژوورێك و کلیلەکەی هێنا و دەرگاکەی کردەوە، سەیرمان کرد هێندەی بەچکەوشترێك چەندە ئەوەندە خورما هەیە، دەستمان کرد بە بردنی خورما و هەرکەسمان بەشی پێویستی خۆی خورمای برد، دوای هەموویان من لامکردەوە چونکە من کۆتا کەسیان بووم، کەچی دەتوت ئەو خورمایە دەستی لێنەدراوە.

## عومەر لە موژدەپێدراوانی بەهەشتە

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (دخلت الجنة فرأيت فيها دارا أو قصرا، فقلت لمن هذا؟ فقالوا لعمر بن الخطاب، فأردت أن أدخل، فذكرت غيرتك)، (چوومە بەهەشت و تیایدا خانوویەك یان کۆشکێکم بینی، وتم ئەمە هی کێیە؟ وتیان هی عومەری کوڕی خەتابە، ویستم بچمە ژوورەوە، بیری غەیرەتتم کەوتەوە ئیتر نەچوومە ژوورەوە)، ئیتر عومەر دەستی کرد بە گریان و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ غەیرەم بەرامبەر بە تۆ؟

پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (أبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة في الجنة والزبير في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة، وسعد في الجنة، وسعيد في الجنة، وأبو عبيدة بن الجراح في الجنة)، (ئەبووبەکر لە بەهەشتە، عومەر لە بەهەشتە، عوثمان لە بەهەشتە، عەلی لە بەهەشتە، طەلحە لە بەهەشتە، زوبەیر لە بەهەشتە، عەبدورەحمانی کوڕی عەوف لە

بەهەشتە، سەعد لە بەهەشتە، سەعید لە بەهەشتە، ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح لە بەهەشتە).

جارێك موغیرە لای سەعیدی کوڕی زەید قسەی بەرامبەر بە عەلی کوڕی ئەبووتالیب کرد، سەعید هەستاو وتی من شایەتی دەدەم بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (عشرة في الجنة: النبي في الجنة، وأبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة بن عبيد الله في الجنة، والزبير بن العوام في الجنة، وسعد بن مالك في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة)،

(دە کەس لە بەهەشتدان: پێغەمبەر ﷺ لە بەهەشتدایە، ئەبووبەکر لە بەهەشتدایە، عومەر لە بەهەشتدایە، عوثمان لە بەهەشتدایە، عەلی لە بەهەشتدایە، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا لە بەهەشتدایە، زوبەیری کوڕی عەووام لە بەهەشتدایە، سەعدی کوڕی مالیك لە بەهەشتدایە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتدایە)، ئینجا زەید وتی

بمویستایە کەسی دەیەمیشم دەوت، وتیان کێیە؟ بێدەنگ بو، دواتر زۆریان لێکرد تا بیلێت، ئەویش وتی سەعیدی کوڕی زەید-واتە خۆی-

جارێك پێغەمبەر ﷺ لەسەر کێوی حیرا وەستابوو، کێوەکە لەریەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئارام بگرە حیرا، چونکە ئەوەی بەسەرتەوەیە یان پێغەمبەرە یان صدیقە یان شەهیدە)، ئەو دەمەش هەریەك لە پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان و عەلی و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵاو زوبەیری کوڕی عەووام و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەسەر کێوەکە بوون.

زەید دەڵێت جارێك پێغەمبەر ﷺ منی نارد و فەرمووی (بڕۆ بۆ لای ئەبووبەکر دەبینیت لە ماڵی خۆیەو لەسەر کۆش دانیشتووەو خۆی کۆکردوەتەوە، پێی بڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامت لێ دەکات و پێت دەفەرمویت موژدەی بەهەشتت لێ بێت، پاشان بڕۆ تا دەگەیتە ثهنییە و لەوێ دەگەیت بە عومەر لەسەر گوێدرێژێکەو رووتاوەی سەری دەرکەوتووە، پێی بڵێ پێغەمبەر ﷺ سەلامت لێ دەکات و دەفەرمویت

موژدەی بەهەشتت لێ بێت، ئینجا بڕۆ تا دەچیتە بازاڕ و دەگەیت بە عوثمان کە تیایدا کڕین و فرۆش دەکات، پێی بڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامت لێ دەکات و دەفەرمویت موژدەی بەهەشتت لێ بێت پاش نارەحەتیەکی سەخت، منیش چووم و هەموو ئەو شتانەم بینی و فەرمانی پێغەمبەری خوام ﷺ بەجێگەیاند، بە هەرکامم دەوت ئەویش دەیوت ئەی پێغەمبەر ﷺ لەکوێیە؟ منیش دەموت لە فلانە شوێنە، هەموان لەگەڵم هاتن تا چووینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ عوثمان وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زەید هاتووە بۆ لام و پاش گەیاندنی سەلامی تۆ وتی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (موژدەی بەهەشتت لێ بێت پاش نارەحەتیەکی سەخت)، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ بەلایەکم دێتەڕێ؟ سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە گۆرانیم نەوتووەو نیازو خواستم نەبووەو دەستی راستم نەداوە لە دوایێنم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئائەوەیە).

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا کە باس لە فەزڵی هاوەڵانێکی دەکات دەفەرموێت: (أرحم أمتي بها ابو بكر وأقواهم في دين الله عمر وأصدقهم حياء عثمان وأقضاهم على بن أبي طالب وأفرضهم زيد وأقرؤهم لكتاب الله أبي بن كعب وأعلمهم بالحلال والحرام معاذ بن جبل وأمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح وأبو هريرة وعاء) (بە رەحمترینی ئوممەتم بە ئوممەتەکەم ئەبوبەکرە و بەهێزترینیان لە ئایینی خوادا عومەرەو بە شەرمترینیان عوثمانە و دادوەرترینیان عەلی کوری ئەبووطالیبەو شارەزاترینیان بە فەرزەکان زەیدە و شارەزاترینیان بە قورئان خوێندنەوە ئوبەی کوڕی کەعبە و شارەزاترینیان بە حەلاّڵ و حەرام موعازی کوڕی جەبەلەو ئەمینداری ئەم ئوممەتەش ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەراحە و ئەبوو هورەیرەش قاپ و جامێکە).

عەمری کوڕی عاص دەڵێت پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ کێ زۆر لات خۆشەویستە؟ فەرمووی عائیشە، وتیان ئەی لەپیاوان؟ فەرمووی ئەبووبەکر، وتیان دواتر، فەرمووی عومەر، وتیان دواتر، فەرمووی ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح.

ئەبووسەعیدی خودری دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (خەوتبوم کە خەوم دی خەڵکی دەخرانەڕوو بۆم و جلیان لەبەر بوو، هەبوو جلەکەی تا لای مەمکی بوو، هەبوو لە خواروو ئەوەوە بوو، عومەرم پێ نیشان درا جلێکی لەبەر بوو کە بەدوایدا دەخشا)، هاوەڵان وتیان چۆن ئەوە لێکدەدەیتەوە؟ فەرمووی ئایینە، واتە ئایینداریەکەی عومەر هێندە زۆرە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: جارێك خەوم بینی كە جامێك شیرم بۆ هێنرا، منیش لێم خواردەوە تا بینیم لە پەنجەكانمەوە دەردەچوو، دواتر زیادەكەیم بەخشی بە عومەری كوڕی خەتاب، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خەوە بەچی لێكدەدەیتەوە؟ فەرمووی زانستە.

عومەری كوڕی خەتاب سێ جار پێشنیازی كرد بۆ پێغەمبەر ﷺ خوای گەورەش ئایەتی دابەزاند كە هەمان پێشنیازی عومەر وەك ئەو بڕیارەی خوا بوو، عومەر دەڵێت وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە مەقامی ئیبراهیمان بكردایە بە موصەلا، ئەوەبوو ئایەت دابەزی (واتخذوا من مقام إبراهيم مصلى)، وتم ئەی پێغەمبەر ﷺ خۆزگە فەرمانت بكردایە ژنەكانت لە پشت پەردەوە قسەیان بكردایە چونكە ئەوان لەگەڵ كەسی چاك و خراپیش قسە دەكەن، ئەوەبوو ئایەتی حیجاب دابەزی، كاتێكیش ژنەكانی پێغەمبەر ﷺ غیرەیان بەكارهێنا، عومەر وتی جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ تەلاقتان بدات لەوانەیە خوای

گەورە لە ئێوە هاوسەرانی چاکتری پێ ببەخشێ، ئەوەبوو ئایەت لەو بارەوە دابەزی،

لە گێڕانەوەکەی موسلیمدا چوارەمیشی هێناوە کە لە پێشنیازی کوشتنی دیلەکانی بەدریشدا ئایەتی قورئان پشتیوانی راکەی عومەری کرد.

حاڵەتی پێنجەمیش هەبوو کە کاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد لەسەر سەرۆکی دووڕووەکان عومەر زۆر تکای کرد لە پێغەمبەر ﷺ نوێژ نەکات لەسەرەی، ئەوەبوو دواتر خوای گەورە ئایەتی دابەزاند و فەرمانی کرد بە پێغەمبەر ﷺ نوێژ لە سەر دووڕووەکان نەکات.

پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو (ئەبووبەکر پیاوێکی زۆر چاکە، عومەر پیاوێکی زۆر چاکە، ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح پیاوێکی زۆر چاکە، ثابتی کوڕی قەیس پیاوێکی زۆر چاکە، موعاذي کوڕی عەمر

پیاوێکی زۆر چاکە، موعاذی کوڕی جەبەل پیاوێکی زۆر چاکە، سەهلی کوڕی بەیضا پیاوێکی زۆر چاکە)

عەبدوڵای کوڕی حەنطەب دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم کە تەماشایەکی ئەبووبەکر و عومەری کرد و فەرمووی (ئەو دوانە چاو وگوێن).

## لە کاتی نەخۆشی پێغەمبەردا ﷺ

عەبدوڵای کوڕی زەمعە دەڵێت کاتێك نەخۆشیەکەی پێغەمبەر ﷺ زۆری بۆ هێنا، منیش هاودەم بە ژمارەیەك لە موسڵمانان لەلای بووم، بیلال بانگی دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی کەسێك بنێرن نوێژ بکات بۆ خەڵکەکە، منیش چووم بینیم عومەر لەناو خەڵکەکەدایەو ئەبووبەکر لەوێ نیە، وتم ئەی عومەر نوێژ بکە بۆ خەڵکەکە، عومەریش هەستا، الله اکبری کرد، کە پێغەمبەر ﷺ دەنگی بیست هەواڵی ئەبووبەکری پرسی، ئەوەبوو دوای ئەوە ئەبووبەکر نوێژی کرد بۆ موسڵمانان، دواتر عومەر پێی وتم ماڵوێران بیت ئیبن زەمعە چیت پێکردم، بەخوا کە وتت بەرنوێژی بکە، وامزانی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی ئەوەی پێکردویت، ئەگەر وا تێنەگەیشتمایە بەرنوێژیم نەدەکرد بۆ خەڵکەکە، منیش وتم بەخوا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێنەکردم، بەڵام کە ئەبووبەکرم نەبینی، ئیتر تۆم بە شیاوتر زانی.

ئیبن عەبباس دەڵێت کاتێك پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت و ئازارەکەی زیادی کرد، فەرمووی (پەڕەیەکم بۆ بهێنن تا نووسراوێکتان بۆ بنووسم تا دوای ئەوە گومڕا نەبن)، عومەری کوڕی خەتاب وتی پێغەمبەر ﷺ ئازار زۆری بۆ هێناوە، هاوکات کتێبی خوا لەنێوماندایە بەسمانە، ئیتر قسەو مشتومڕ لەنێو هاوەڵاندا زۆر بوو تا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (قوموا عنی ولا ینبغی عندی التنازع)، (لەلام هەستن و بڕۆن و شیاو نیە لای من ناکۆکی هەبێت)، ئیبن عەبباس کە ئەم فەرموودەی دەگێڕایەوە دەیوت ڕۆژی پێنج شەممە بوو، ئینجا دەستی کرد بە گریان و زۆر گریا.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، ئینجا عومەر تووڕە بووبوو دەیوت هەرکەس بڵێت پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە بەم شمشێرە دەدەم لە گەردنی، ئەوەبوو خەڵکەکە بێدەنگ بوون، وتیان ئەی سالیم بڕۆ بۆ لای هاوەڵەکەی پێغەمبەر ﷺ و بانگی بکە، منیش چووم تا بینیم ئەبووبەکر لە مزگەوت وەستابوو، کە منی بینی وتی پێغەمبەر ﷺ

وەفاتی کرد؟ منیش وتم عومەر دەڵێت هەرکەس بڵێت وەفاتی کردووە ئەوە بەم شمشێرەم دەدەم لە گەردنی، ئەبووبەکر دەستی خستە سەر شانم و کەوتە ڕێ تا هاتە ژوورەوەو خەڵکەکە ڕێیان بۆ کردەوە تا گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ و خۆی دا بەسەریدا و دەموچاوی خستەڕوو و دەستی دا لە دەموچاوی و ئیتر دڵنیا بوو وەفاتی کردووە، ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە (إنك ميت و إنهم ميتون)، خەڵکەکە وتیان ئەی هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە؟ وتی بەڵێ...

## شەهیدبوونی زەیدی برای:

کاتێ زەیدی برای عومەر لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو عومەری برای دەیوت زەید لە هەردوو چاکەکەدا پێش من کەوت، پێش من موسڵمان بوو، پێش منیش شەهید بوو.

عومەر زۆر خەفەتی خوارد بە مەرگی براکەی، دەیوت لە هەرکوێوە با هەڵدەکات من بۆنی زەیدی برامی لێدەکەم.

عومەری کوڕی خەتاب موتەممیمی کوڕی نوەیرەی بینی، موتەممیم شیعرێکی بۆ مەرگی براکەی خۆی هۆنیبوویەوە کە مالیکی کوڕی نوەیرە بوو، عومەر دەیوت ئەگەر منیش شیعرم بزانیایە بە دڵنیاییەوە وەك تۆ شیعرم دەهۆنیەوە بەسەر زەیدی برامدا، موتەممیم وتی جا ئەگەر براکەی من وەك براکەی تۆ بڕۆیشتایە هیچ دڵگران نەدەبووم بۆی، عومەرو تی هیچ کەس هێندەی تۆ جوان دڵنەوایی نەکردوم.

## بوون بە خەلیفە

لە مانگی جومادیلئاخیرەی ساڵی سیانزەی کۆچیدا ئەبووبەکری صدیق تووشی نەخۆشی بوو و ماوەی نزیکەی پانزە رۆژ نەخۆشیەکەی بەردەوام بوو، لەو ماوەدا عومەری کوڕی خەتاب بەرنوێژی دەکرد بۆ موسڵمانان، لەو ماوەدا ئەبووبەکری صدیق عومەری کوڕی خەتابی بۆ جێگرتنەوەی خۆی دیاری کرد و عوثمانی کوڕی عەففانی بانگ کرد و داوای لێکرد بە نووسراوێك ئەوە بنووسێت، ئینجا نووسراوەکە خوێنرایەوە بەسەر موسڵماناندا و ئەوانیش رازی بوون.

کاتێك ئەبووبەکری صدیق نەخۆش کەوت، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی بانگ کرد و وتی هەواڵی عومەرم پێ بدە، ئەویش وەسفی کرد و وتی بەڵام توندیەکی تێدایە، ئەبووبەکر وتی ئەوە لەبەرئەوەیە کە منی دیوە نەرم بوم بۆیە، ئەگەر خۆی بێت زۆرێك لەوەی هەیەتی واز لێدێنێت.

حەسەن دەڵێت کاتێك ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات بە عائیشەی وت ئەی عائیشە سەیری ئەو وشترە بکە کە لە شیرەکەیمان دەخواردەوەو ئەو تەشتەی بەکارمان دەهێنا و ئەو بەرگەی دەمانپۆشی، ئێمە کاتێك کاروباری موسڵمانانمان بەدەست بوو ئەو شتانەمان بەکاردەهێنا، جا ئەگەر مردم ئەوانە ببە بۆ عومەر، ئەوەبوو کە ئەبووبەکر مرد ئەو شتانەی نارد بۆ عومەر، ئەویش وتی خوا لێت رازی بێت ئەی ئەبووبەکر، باری ئەوەی دوای خۆتت قورس کرد.

## سەرەتای دەست بەکاربوونی

عومەری کوڕی خەططاب لەگەڵ دەستبەکاربوونیدا خێرا بەرپرسیارێتی گەورەی بە ئەبووعوبەیدە راسپارد، ئەوەبوو نامەی نووسی بۆ خەڵکی یەرمووك و پێیی راگەیاندن کە ئەبووعوبەیدەی کردووە بە ئەمیریان، بە ئەبووعوبەیدەشی وت کە تۆ بەرپرسی خەڵکیت، ئەگەر خوا سەریخستیت ئەوە خەڵکی عێراق بۆ عێراق بنێرەوە.

کاتێك سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە عێراق سەرقاڵی فتووحات بوو، عومەری کوڕی خەططاب نامەی نارد بۆ ئەبووعوبەیدە لە شام و فەرمانی پێکرد سەربازەکانی بنێرێت بۆ عێراق بۆ پشتیوانی سەعد، ئەویش سەربازەکانی نارد و هاشمی کوڕی عوتبەی کرد بە ئەمیریان.

کاتێك عومەری کوڕی خەططاب بوو بە خەلیفە، خالیدی کوڕی وەلیدی لە پۆستەکەی لابرد و بە نامەیەك ئەوەی نارد بۆ ئەبوو

عوبەیدە، خالیدیش لە وەڵامدا وتی گوێڕایەڵی فەرمانی ئەمیری باوەڕدارانم، پاش ئەوەش لە ژێر فەرمانی ئەبوو عوبەیدەدا مایەوەو بەردەوام جیهادی دەکرد، وەك لە فەتحی دیمەشقدا بەشداری کرد و ئەبووعوبەیدەش بەرپرس بوو.

کاتێك ئەبووعوبەیدە ئەو نامەی پێگەیشت کە خالید لە پۆستەکەی کەنار بخرێت خۆی ئامادە نەبوو بیلێت بە خالید، بۆیە کەسێکی تر ئەوەی گەیاند بە خالید، خالید چوو بۆ لای ئەبوو عوبەیدەو وتی رەحمەتی خوات لێ بێت بۆچی خۆت پێت نەوتم؟ ئەویش وتی حەزم نەکرد هەواڵی ناخۆشت پێبدەم.

ئەبووعوبەیدە لە ماوەی ئەمیرایەتیەکەیدا توانی فتووحاتێکی زۆر بکات و بە رێککەوتن فەتحی دیمەشقیش بکات و خالیدی کوڕی وەلیدیش لەو فەتحەدا هاوکارێکی گەورەی بوو.

کاتێك ئەبووعوبەیدە ئەمیر بوو لە پیاوێك تووڕە بوو و ئازارێکی دا، خالیدیش وتی وا مەکە، خالید پێی وترا کە ئەمیرت تووڕە کردووە، بۆیە چوو بۆ لای ئەبووعوبەیدەو وتی من مەبەستم ئەوە نەبووە تۆ تووڕە بکەم، بەڵام بیستوومە لە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو (إن أشد الناس عذابا يوم القيامة أشد الناس عذابا للناس في الدنيا)، (سەختترین سزای رۆژی دوایی بۆ ئەو کەسانەیە کە لە دنیادا سەختترین سزای خەڵکیان داوە).

عومەری کوڕی خەتاب زۆر سەرسام بوو بە ئەبووعوبەیدە، ئەوەبوو دەیوت ئەگەر سەرەمەرگم هات و ئەبووعوبەیدە زیندوو بێت، ئەوە ئەودەکەم بە جێنشینی خۆم، ئەگەریش پەروەردگارم پرسیاری لێکردم بۆچی ئەوم کردووە بۆ جێنشینی خۆم لەسەر ئوممەتی موحەممەد، ئەوە دەڵێم من بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو (هەر ئوممەتێك سپاردەکارێکی هەیەو سپاردەکاری ئەم ئوممەتەش ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراحە).

جارێك عومەر لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانیدا بوو، وتی هەرکامتان هیوا و ئاواتی خۆتان بڵێن، هەرکەسەو هیواو ئاواتی خۆیوت، ئینجا عومەریش هیواو ئاواتی خۆی وت و من خۆزگە دەخوازم پڕی ماڵێك پیاوی وەك ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراحم هەبێت.

## فتووحات لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا:

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتابدا فتووحات لە چەند بەرەیەکدا کرا و بەشێکی زۆری ناوچەی دی کەوتنە سەر سنووری دەوڵەتی ئیسلامی و خاکی ئیسلام دوو هێندەش زیاتر زیادی کرد:

لە عێراقدا فتووحاتێکی زۆر کرا و هەر لە سەردەمی عومەریشدا فتوحاتی کوردستان روویدا، لە دیارترین جەنگەکانی ئەو ماوەش جەنگی قادسیە و جەنگی نەهاوەند بوو.

فتووحات بەرەو رۆژهەڵآت زۆر پێشڕەوی کردو هەریەك لە هەمەدان و رەی و جورجان و ئازەربایجان و ئیصطەخر و و کەرمان و سجستان وموکران کرا. لە بەرەی شامیشەوە فتووحات بەردەوام بوو و ناوچەکان یەك دوای یەك فەتح دەکران تا دواجار بەیتولمەقدیسیش فەتح کرا. هەر لەو سەردەمەدا فەتحی میصر و ئەو ناوچانەش کرا کە ئەمڕۆ دەکەونە وڵاتی لیبیاوە.

# پرسی ئالوبەیت

عومەری کوڕی خەتاب ڕێزێکی زۆری دەنا لە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەتا کاتێك دەیەوێت بەخششی خەڵك دیاری بکات، ڕاوێژی کرد بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، عەبدورەحمانیش وتی لە خۆتەوە دەست پێ بکە، چونکە تۆ شیاوتریت بەوە، عومەریش وتی نا سوێند بەخوا لە نزیکترین کەسەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەست پێ دەکەم، ئینجا لەوانەی بەشداری بەدر بوون، بەوجۆرە دەچم تا دەگاتە خۆم، ئەوەبوو یەکەمجار پێنج هەزاری بڕیەوە بۆ عەلی کوڕی ئەبوو تالیب، دواتر بۆ هاشمیە بەشداربووەکانی بەدر هەروەها پێنج هەزار دیناری بڕیەوە بۆ حوسەینیش.

فەرموودەیەك بە صەحیحی هاتووە کە مشتومڕێك لەسەر ڕوانینی عەلی بۆ میراتی پێغەمبەر ﷺ دەخاتەڕوو، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:

مالیکی کوڕی ئەوس دەڵێت عومەری کوڕی خەتاب ناردی بە شوێن مندا، منیش چووم بۆ لای و ئەوکات خۆر لە بەرزایی ئاسمان بوو، دەبینم لەماڵەوە دانیشتووەو لەسەر پشتیەکی پێستە پاڵی داوەتەوە، پێی وتم ئەی مال-ناوەکەی کورت کردوەتەوە- خەڵکێ لە هۆزەکەت هاتن و منیش بەخششێکی کەمم کردن، بڕۆ لە نێوانیاندا دابەشی بکە، منیش وتم بریا کەسێکی ترت لەبری من راسپاردایە، ئەویش وتی مالیك لێنەوە، ئینجا یەرفە ؐ –پەردەدارەکەی عومەر- هات و وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مۆڵەت دەدەیت عوثمان و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بێنە ژوورەوە؟ عومەر وتی بەڵێ، ئەویش مۆڵەتی پێدان و هاتنە ژوورەوە، ئینجا یەرفە هاتەوەو وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مۆڵەتی عەبباس و عەلی دەدەیت بێنە ژوورەوە؟ وتی بەڵێ، مۆڵەتی دا و ئەوانیش هاتنە ژوورەوە، عەبباس وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران لەنێوان من و ئەم درۆزنە تاوانبارە ناپاکە خیانەتکارەدا دادوەری بکە-مەبەستی عەلی بوو-، ئەوانەی لەوێ ئامادە بوون وتیان بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران

دادوەری نێوانیان بکەو رەحم بەرامبەریان بنوێنە، -مالیك دەڵێت وام هاتە پێش چاو ئەو چوارەش بۆ هەمان شت هاتبوون بۆ لای عومەر-، عومەر وتی لەسەرخۆ بن، دواتر روویکردەوە ئەو دەستەیە و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (میراتی جێناهێڵین، هەرچیمان جێهێشت صەدەقەیە)؟ وتیان بەڵێ، ئینجا تەماشای عەلی و عەبباسی کرد و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (میراتی جێناهێڵین، هەرچیمان جێهێشت صەدەقەیە)؟ وتیان بەڵێ، عومەر وتی دەی خوا تایبەتمەندیەکی بە پێغەمبەر ﷺ بەخشیوە کە بە هیچ کەسی تری نەبەخشیوە، خوا دەفەرموێت: (وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ، لەوەش ئەوەی بەنو نەضیر بوو، دەی بەخوا تایبەتی نەکرد بە خۆی و بێبەشی نەکردن، پێغەمبەر ﷺ خەرجی ساڵێك یان خەرجی ساڵێکی خۆی و خێزانەکانی

لێ هەڵدەگرت و ئەوەی دەمایەوە لە ڕێی خوادا دەیبەخشی، ئینجا عومەر ڕوویکردە ئەو چوارەی تر و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا ئەوە دەزانن؟ وتیان بەڵێ، ئینجا لایکرد بە لای عەلی و عەبباسدا و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا ئەم دوانەشتان ئەمە دەزانن؟ وتیان بەڵێ، عومەر وتی کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد ئەبووبەکر وتی من دۆست و وەلی پێغەمبەری خوام ﷺ تۆ-عەبباسی دەدواند- و ئەمە-واتە عەلی- چوون بۆ لای ئەبووبەکر، تۆ میراتی برازاکەتت داوا دەکرد-واتە پێغەمبەر ﷺ ئەمیش میراتی ژنەکەی-واتە فاطیمە- لە باوکیەوە –واتە پێغەمبەر ﷺ داوا دەکرد، ئەبووبەکر وتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (میراتی جێناهێڵین، ئەوەی جێی دەهێڵین صەدەقەیە)، کەچی ئەم دوانەتان واتاندەزانی درۆ دەکات و تاوانبار و ناپاکە، خواش دەزانێت ڕاستگۆ و چاکەکار و ژیر و تێگەیشتوو بوو و شوێن حەق کەوتبوو، ئەوەبوو دەسەڵاتی گرتەدەست، دواتر کە ئەبووبەکر وەفاتی کرد من وتم من دۆست و

وەلی پێغەمبەر ﷺ و دۆست و وەلی ئەبووبەکرم، کەچی ئەم دوانەتان واتاندەزانی من درۆ دەکەم و تاوانبار و ناپاك و خیانەتکارم، خواش زانایە کە من راستگۆ و چاکەکار و ژیر و تێگەیشتوو و شوێنکەوتەی حەقم، ئەوەبوو دەسەڵاتم گرتەدەست، ئینجا ئێستا تۆ و ئەمە و هەموو ئێوەش هاتون و قسەتان یەکەو لەو بارەوە پرسیار لە من دەکەن-واتە باری دەسەڵات-، منیش دەڵێم ئەگەر ئەم دوانەتان دەتانەوێت ئەوە بدەمە ئێوەو بەرامبەر بەوە بەڵێنی خواتان لەسەر بێت کە بەو جۆرەی پێغەمبەر ﷺ لەسەری بوو لەسەری برۆن، لەسەر ئەوە لە منی وەربگرن و دواتر بێن بۆ لام و داوا بکەن بە بارێکی تر-جیا لەوەی پێغەمبەر ﷺ لەسەری دەرۆیشت- دادوەری نێوانتان بکەم؟! نا بەخوا تا رۆژی دوایی جگە لەوە-کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری دەچوو- دادوەری نێوانتان ناکەم، ئەگەریش دەرەقەتی ئەوە نایەن ئەوە بیدەنەوە دەست خۆم.

لەم فەرموودەدا بۆمان دەردەکەوێت لەلایەکەوە هەموو ئەو هاوەڵانە دانیان بەوەدا ناوە کە بیستوویانە لە پێغەمبەر ﷺ میراتێ جێناهێڵێت و لەوەدا ئەبووبەکر لەسەر حەق بوو کە میراتی نەبەخشی بە فاطیمە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر بوونی کێشەی نێوان هاوەڵان و هەوڵدانیان بۆ چارەسەرکردنی، هەروەها عومەر لە هەڵوێستی عەلی و عەبباسەوە روانینی خۆی بۆ ئەو هەڵوێستەیان نیشانداوە کە لەوانەیە ئەوان ئەویش و ئەبووبەکریش بە درۆزن و ناپاك تەماشا بکەن، لەکاتێکدا بەپێی گێڕانەوەی تر کە باسمان کردووە ئەو گومانە نەبووە، بەڵام ئەم دەربڕینە هاوشێوەی ئەوەیە کەسێك کە بەرامبەرەکەی دەدوێنێت بۆ زیاتر سەلماندنی حەقبوونی دەڵێت هەرچەندە تۆ وادەزانیت من ئاواو ئاوەهام، لەلایەکەوە تا ئەگەر ناخی بەرامبەر شتێکی تێدا بێت رێی بۆ بکاتەوە تا ئاشکرای بکات، لەلایەکی تریشەوە تا پێی بڵێت من رام وایە تۆ وا بیر دەکەیتەوە.

زەمەخشەری گێڕانەوەیەکی هێناوە کە لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتابدا کاتێك فتووحاتی فارس کرا، سێ کچی یەزگوردی کوڕی شەهریاری کوڕی کیسرا بە کەنیزەك گیرابوون و هێنران بۆ خەلیفەی باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب، ئەویش ویستی بیانفرۆشێت، بەڵام عەلی کوڕی ئەبوو طالیب وتی کچانی پاشاکان نافرۆشرێن، بۆیە پارەی هەموویانی دا و دابەشی کردن لە نێوان حوسەینی کوڕی و موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکر و عەبدوڵای کوڕی عومەردا.

سەبارەت بەو فەرموودەش کە هاتووە سەلمان لە ئالوبەیتە، عومەر هەمان ڕێزی سەلمانی فارسی گرت، عومەر کە مووچەی بۆ خەڵك بڕیەوە، بۆ سەلمانی فارسی چوار هەزاری دانابوو، بەڵام بۆ کوڕەکەی خۆی (عەبدوڵای کوڕی عومەر) سێ هەزارو نیوی دانابوو، کابرایەك وتی چۆن دەکرێت بۆ کابرایەکی فارسی چوار هەزار و بۆ کوڕی ئەمیری باوەڕداران سێ هەزار و نیو بێت؟! خەڵکەکە وتیان سەلمان

لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەشداری غەزایەك بووە كە ئیبن عومەر تیایدا بەشدار نەبووە.

حوسەین دەڵێت رۆژێك عومەر چوویە سەر مینبەرەكەی پێغەمبەر ﷺ و منیش چوومە سەرەوەو وتم لە مینبەرەكەی باوكم دابەزەو برۆ بۆ مینبەرەكەی باوكی خۆت، عومەر وتی دەی ئاخۆ باوكی من مینبەری نەبووە، ئینجا منی لای خۆی دانیشاند، دواتر كە دابەزی وتی كوڕە شیرینەكەم كێ فێری كردیت ئەم قسەیە بكەیت؟ منیش وتم كەس فێری نەكردوم، عومەر وتی كوڕە شیرینەكەم خوای گەورە و پاشان ئێوە مووی لەسەر سەرمان رواندووە،-واتە رێزداری كردوین- ئینجا دەستی خستە سەر سەری حوسەین و وتی كوڕی شیرینم وەرەو سەردانمان بكە. عومەر جارێك جلی بەخشی بە مندالآنی هاوەڵان، بەڵام لەناو جلەكاندا جلی شیاو بە حەسەن و حوسەینی لێ نەبوو، بۆیە ناردی بۆ یەمەن لەوێ دوو جلی تایبەتیان هێنا بۆ حەسەن و حوسەین، ئینجا عومەر وتی ئیتر ئێستا دڵم ئۆخەی كرد.

## دانانی مێژووی کۆچی

یەکێك لە کارەکانی عومەری کوڕی خەتاب دانانی مێژووی کۆچی بوو، لە ساڵی حەڤدە یان هەژدەی کۆچیدا عومەری کوڕی خەططاب مێژووی کۆچی دانا و کۆچکردنی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ مەدینە کرد بە دەستپێکی ئەو مێژووە.

## لابردنی کاربەدەستەکان

### لابردنی خالیدی کوڕی وەلید

کاتێك عومەری کوڕی خەتاب بوو بە خەلیفە، خالیدی کوڕی وەلیدی لە پۆستەکەی لابرد و بە نامەیەك ئەوەی نارد بۆ ئەبوو عوبەیدە، خالیدیش لە وەڵامدا وتی گوێڕایەڵی فەرمانی ئەمیری باوەڕدارانم پاش ئەوەش لە ژێر فەرمانی ئەبوو عوبەیدەدا مایەوەو

بەردەوام جیهادی دەکرد، وەك لە فەتحی دیمەشقدا بەشداری کرد و ئەبووعوبەیدەش بەرپرس بوو.

لێرەدا تەمومژیەك دروست کراوە سەبارەت بە هۆکاری لابردنی خالیدی کوڕی وەلید لەلایەن عومەری کوڕی خەتتابەوە، جا هەیانە هۆکارەکەی بە کینەیەکی سەردەمی جاهیلی دادەنێن، هەیانە هۆکارەکەی دەبەستنەوە بە کوشتنی مالیکی کوڕی نوەیرەوە، هەشیانە دەیبەستێتەوە بە گوێڕایەڵ نەبوونی خالید بۆ عومەر، وا لە خوارەوە گێڕانەوەکان دەخەینەڕوو:

کاتێك عومەر و خالید مێرمنداڵ بون زۆرانێکیان گرت، خالید قاچێکی عومەری شکاند، ئەو داخە لە دەروونی عومەردا مایەوە تا کە بوو بە خەلیفە تۆڵەی کردەوە.

لە سەردەمی ئەبووبەکردا عومەر بە ئەبووبەکری وت نامەیەك بنێرە بۆ خالید و فەرمانی پێ بکە هیچ جووڵەیەك نەکات بە فەرمانی تۆ نەبێت،

خالیدیش وەڵامی دایەوە یان لە هەڵسوکەوتمدا دەستم واڵا بکە یان لامبەرە، عومەریش وتی دەی لایبەرە، ئەبووبەکر وتی جا کێ جێی خالیدم بۆ دەگرێتەوە، لە سەردەمی عومەریشدا خەلیفە هەمان نامەی بۆ نووسی و خالیدیش هەمان وەڵامی بۆ عومەر نووسی کە بۆ ئەبووبەکری نووسیبوو، عومەریش لایبرد، پاش ماوەیەك داوای لە خالید کردەوە تا پۆست وەربگرێــتەوە، بەڵام خالید ئامادەیی نەبوو مەگەر بەو مەرجەی دەستی واڵا بکات، عومەریش بەوە رازی نەدەبوو.

بۆیە دەتوانین بڵێین تاکە هۆکاری لابردنی خالید لەلایەن عومەر بریتی بوو لەو جموجووڵە سەربەخۆییەی خالید لە کاتی جەنگ و فتووحاتیدا، عومەریش لای سەخت بوو لە پاڵ هەزار راستیدا ناحەقیەك هەبێت، بۆیە خالیدی لابرد، بەڵام ئەگەر تەماشا بکەین هۆکارێکی سەرکەوتنە گەورەکانی خالید ئەو جۆرە سەربەخۆیی و دەست والآییەی بوو کە هەیبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبووبەکری

صدیقیش ئەو دەرفەتەیان بۆ هێشتەوەو لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێك لە لێپێچینەوەو لێ توندکردنەوەیان بۆ بەکاردەهێنا، بەڵام لە پۆستەکەی لایان نەدەبرد، چونکە ئەوە شمشێری هەڵکراوی خوا بوو بە رووی بێباوەڕاندا، دەبینین خالید بەو دەستوالاییەی بڕیاردانەی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ چەند هەڵەیەکی کرد، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ کەناری نەخست، لە سەردەمی ئەبووبەکریشدا دووبارە لە کوشتنی مالیکی کوڕی نوەیرەدا ئیجتیهادی هەڵەی کرد، بەڵام ئەبووبەکر لای نەبرد، عومەریش کە بوو بە خەلیفە ئیجتیهادێکی کرد بە لابردنی خالید، ئایا پێکای یان نا، خوا زاناترە.

# لابردنی عەماری کوڕی یاسر

عومەری کوڕی خەتاب عەماری کوڕی یاسیری هاودەم بە ئیبن مەسعوود نارد بۆ عێراق و ئەرکی کارگێڕی و مامۆستایی پێ بەخشین و نامەیەکی هاودەم بەوان نارد بۆ خەڵکەکەو تیایدا نووسیبووی: من دوانم لە کەسە ناوازەکانی ناو هاوەڵان بۆ ناردون کە بەشداربووی بەدر بوون، گوێڕایەڵیان بن و پێشەنگییان پێوە بکەن، من لەبەر ئێوە خۆم بێبەش کردووە لە نزیکی ئەو دوانە.

کاتێك خەڵکی بەصرە هێرشیان برد بۆ نەهاوەند و بۆیان فەتح نەکرا، عەمار بە خەڵکی کووفەوە چوو بۆ یارمەتییان و خوا فەتحی بەخشی، دواتر کە ویستیان دەستکەوتەکان دابەش بکەن، خەڵکی بەصرە ویستیان بەشی خەڵکی کووفە نەدەن، جا یەکێك لە بەصریەکان بە عەماری وت ئەی گوێ قرتاو دەتەوێت تۆیش لە دەستکەوتەکانماندا بەشدار بیت؟ عەمار وتی قسەت بە گوێ چاکەکەم وت، ئەم گوێیەم لە غەزای هاودەمی پێغەمبەردا ﷺ وای لێهات، دواتر نامەی نووسی

بۆ خەلیفە عومەر و مەسەلەکەی بۆ خستەڕوو، خەلیفەش وەڵامی نوسی هەرکەس بەشداری جەنگەکە بووبێت دەستەکەوتی بۆ هەیە.

دواتر خەلیفە عومەر عەمماری لە پۆستەکەی لابرد، چەند هۆکارێك باسکراوە، لەوانە خەڵکێك لای خەلیفە قسەی زۆریان لەسەر کردووەو ئەویش بێ عاجزبوون لایبردووە، یان دەوترێت عومەر کە پرسیاری کرد لە جەریر عەممار چۆنە؟ وتی شارەزایی سیاسەتی نیە، بۆیە بڕیاری دا لایبەرێت، عومەر بە عەمماری وت پێت ناخۆش نەبوو لامانبردیت؟ عەممار وتی کە ئەو ئەرکەت پێ سپاردم پێم ناخۆش بوو، کە لاشت بردم پێم ناخۆش بوو.

# لابردنی شورەحبیل

کاتێك عومەر ویستی شورەحبیلی کوڕی حەسەنە لە پۆستەکەی لاببات، شورەحبیل وتی ئەی عومەر بڵێ لەسەرچی لامدەبەیت؟ چی تووڕەی کردویت؟ عومەر وەڵامی دایەوە، نا لە تووڕەییەوە نیە، بەڵکو کەسی لە تۆ بەهێزترمان بەدیکرد، بۆیە نەمانویست لای خوا تاوانبار بین، شورەحبیل وتی دەی لای خەڵك روونی بکەرەوە، عومەریش چوویە سەر مینبەر و وتی ئێمە شورەحبیلی کوڕی حەسەنەمان کرد بە بەرپرس و دواتریش بێ ئەوەی لێی تووڕەو بێزار بین لامانبرد، تەنها لەبەرئەوەی کەسی لەو بەهێزترمان بینی بۆیە لامانبرد تا لای خوا تاوانبار نەبین.

# لابردنی سەعد

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەلایەن خەلیفە عومەر کرابوو بە والی کووفە، دەوترێت سەعد بناغەدانەری کووفە بووەو کردوویەتی بە شار بەڵام لەساڵی بیستی کۆچیدا خەلیفە سەعدی لە والیەتی کووفە لابرد. بەهۆی سکاڵآی خەڵکەوە سەعد لە ساڵی بیست و یەکی کۆچیدا لەلایەن خەلیفە عومەر لە ئەمیرایەتی کووفە لابرا. عومەر بڕیاری دا وردەکاری دارایی والیەکانی بزانێت، بۆیە نامەی نارد بۆیان تا هەموویان ڕێژەی سامانی خۆیان بنووسن، نامەی نارد بۆ سەعدیش، کە سەعد ڕێژەی سامانەکەی خۆی نووسی، عومەر سامانەکەی کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ هێشتەوەو نیوەکەی تری خستە بەیتولماڵەوە. بەڵام ئەو لابردنەی سەعد لەبەر کەمتەرخەمی سەعد نەبوو، وەك عومەر خۆی دەڵێت من سەعدم لەبەر لاوازی یان ناپاکبوونی لانەبردووە، بۆیە دەبینین پێش شەهیدبوونی شەش کەس کاندید دەکات بۆ خیلافەت، یەکێکیان سەعدی کوڕی وەققاصە.

# لابردنی ئەبووهورەیرە

ئەبووهورەیرە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب لەلایەن خەلیفەوە کرا بە بەرپرسی بەحرەین، دواتر پاش ماوەیەك خەلیفە لەو پۆستەی لایبرد، دواتر خەلیفە ویستی ئەرکی تری پێ بسپێرێت، بەڵام ئەبووهورەیرە ئامادە نەبوو پۆست وەربگرێت، بۆیە لە مەدینە مایەوەو سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی زانست بوو.

ئەبووهورەیرە دەڵێت کە لە بەحرەینەوە هاتمەوە، عومەر وتی ئەی ئەبووهورەیرە دەسەڵات چۆن بوو؟ وتم کە منت نارد حەزم پێ نەبوو، کە لاتبردم حەزم پێی بوو، ئینجا ئەبووهورەیرە چوارسەد هەزار درهەمی لە بەحرەینەوە هێنا، خەلیفە وتی هیچت بە ناحەق وەرنەگرتووە؟ وتی نا، وتی ئەی خۆت چەندت هەیە؟ وتی بیست هەزار، عومەر وتی لەکوێت بوو؟ ئەبووهورەیرە وتی بازرگانیم دەکرد، عومەر وتی سەرمایە و بەشەکەی خۆت هەڵبگرەوەو ئەوی تری بخەرە بەیتولمالەوە.

## بەندکردنی ئیبن مەسعوود

عومەری کوڕی خەططاب کاتێك عەممەاری کوڕی یاسری نارد تا ببێتە ئەمیری کووفە، ئیبن مەسعوودیشی نارد وەك مامۆستا بۆ خەڵکی کووفە و وتی ئەو لەخۆبوردنەم کردووە کە عەبدوڵام لای خۆم نەهێشتووەتەوەو ناردوومە بۆتان. جارێك ئیبن مەسعوود هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب و خەڵکەکەی لای هەموو لە دەوری کۆبوونەوە، عومەریش پێکەنی و دواتر کەوتە قسەکردن لەگەڵ ئیبن مەسعوود و بە بینینی ئیبن مەسعوود دەموچاوی گەشابوویەوە و زەردەخەنەی بۆ دەکرد، دواتر کە ئیبن مەسعوود چوو عومەر هەر تەماشای دەکرد و دەیوت کووپێکی پڕ زانستە. دواتر لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا عومەری کوڕی خەتاب ماوەی یەك ساڵ ئیبن مەسعوودو چەند هاوەڵێکی تری لە مەدینە بەند کرد تا ئەو کاتەی شەهید بوو، ئەوکات عوثمان ئازادی کردن، عومەر لەبەرئەوە بەندی کردن چونکە ئەوانە فەرموودەی زۆریان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕایەوە.

# ژیانی ئاسایی

شەعبی دەڵێ جارێك ئوبەی لەگەڵ عومەری کوڕی خەتابدا کێشەیەکی هەبوو، ئەوکات عومەر خەلیفە بوو، ئوبەی وتی عومەر جا تۆ خۆت دەسەڵاتداریت، عومەر وتی دەی با کەسێك ببێتە دادوەری نێوانمان، ئوبەی وتی با زەید بێت، ئەوەبوو چوون بۆ لای زەید و ئەویش دادوەری لەنێوانیاندا کرد، زەید وتی ئەی ئوبەی بەڵگەت چیە؟ ئەویش وتی هیچ بەڵگەیەکم پێ نیە، زەید وتی دەی دەرفەت بدە با ئەمیری باوەڕداران سوێند نەدەم، عومەرو تی ئەگەر بە پێویستی دەزانیت رێ مەدە ئەمیری باوەڕداران ئەو سوێندە نەخوات.

جارێك کاروانێکی بازرگانی هاتنە مەدینە، عومەری کوڕی خەتاب کە خەلیفە بوو بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی وت با ئەمشەو پاسەوانی ئەمانە بکەین، ئەویش وتی باشە، ئەوەبوو ئەو شەوە عومەرو عەبدوڕەحمان پێکەوە پاسەوانی ئەو کاروانەیان کرد، منداڵێك بەردەوام دەگریا، عومەر بە دایکی وت لەخوا بترسە وریای

منداڵەکەت بە، کەچی منداڵەگە هەر دەگریا، چەند جارێك عومەر ئەوەی وت بە دایکی، دواجار دایکی هاتە جواب و وتی ئەمەوێت لەشیری ببڕمەوە، بەڵام بیری ناچێتەوە، عومەر وتی بۆ وا دەکەیت؟ وتی ئاخۆ عومەر تەنها بۆ کەسێك بەشی بڕیوەتەوە کە شیرەخۆە نەبێت، عومەر وتی ماڵوێران پەلە مەکە لە شیربڕینەوە، ئەوەبوو بۆ بەیانی بڕیاری دا هەر منداڵێك لەدایك بوو هەر لە لەدایکبوونیەوە بەشی بۆ ببڕێتەوە.

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتابدا خەلیفە بیشری کوڕی عاصمی کرد بە بەرپرس لە کۆکردنەوەی صەدەقەی هەوەزان، بەڵام بیشر دواکەوت، خەلیفە چوو بۆ لای و پێی وت بۆچی دواکەوتیت؟ مەگەر گوێڕایەڵی ئێمەت لەسەر نیە؟ ئەویش وتی با، بەڵام من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو (من ولي شيئا من أمور المسلمين أتي به يوم القيامة حتى يوقف على جسر جهنم، فإن كان محسنا نجا وإن كان مسيئا انخرق به الجسر فهوى فيه سبعين

خریفا)، (هەرکەس شتێك لە کاروباری موسڵمانانی گرتەدەست رۆژی دوایی دەهێنرێت تا لەسەر پردی دۆزەخ دەوەستێنرێت، ئەگەر چاکەکار بێت رزگاری دەبێت، وە ئەگەر خراپەکار بێت پردەکە فڕێی دەداتە دۆزەخەوە تا ئەوەی حەفتا پاییز بەناو دۆزەخدا رۆدەچێت)، عومەری کوڕی خەتتاب کە ئەمەی بیست خەم و پەژارە دایگرت و بە دڵتەنگیەوە ئەوێی جێهێشت، لەرێدا ئەبووذەری غیفاری پێگەیشت، ئەبووذەر پێی وت چیە دەتبینم غەمباریت؟ وتی چۆن دڵگران نەبم لەکاتێکدا لە بیشری کوڕی عاصمم بیست دەیوت پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی هەرکەس شتێك لە کاروباری موسڵمانانی گرتەدەست، رۆژی دوایی دەهێنرێت تا لەسەر پردی دۆزەخ دەوەستێنرێت، ئەگەر چاکەکار بێت رزگاری دەبێت، وە ئەگەر خراپەکار بێت پردەکە فڕێی دەداتە دۆزەخەوە تا ئەوەی حەفتا پاییز بەناو دۆزەخدا رۆدەچێت، ئەبووذەر وتی تۆ ئەو فەرموودەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبیستووە؟ عومەر وتی نا، ئەبووذەر وتی دەی من شایەتی دەدەم لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو (هەرکەس شتێك لە کاروباری یەك کەسی

گرتەدەست رۆژی دوایی دەهێنرێت تا لەسەر پردی دۆزەخ دەوەستێنرێت، ئەگەر چاکەکار بێت رزگاری دەبێت، وە ئەگەر خراپەکار بێت پردەکە فڕێی دەداتە دۆزەخەوە تا ئەوەی حەفتا پاییز بەناو دۆزەخدا رۆدەچێت، ئاگری دۆزەخیش زۆر رەش و تاریکە)، جا کام فەرموودەیان زیاتر دڵی ترساندیت؟ ئەویش وتی هەردووکیان، ئینجا عومەر وتی کێ بە هەموو چاك و خراپییەوە ئەم دەسەڵآتەم لێ وەردەگرێت و لەبری من دەسەڵآتداری دەکات؟ ئەبووذەر وتی هەرکەسێك خوای گەورە لووت بڕاوی بکات و کوڵمیشی بە زەویەوە بنووسێنێت.

کاتێك عومەری کوڕی خەتاب چوویە شام موسڵمانان داوایان کرد لە عومەر تا تکایان بۆ بکات بیلال بانگیان بۆ بدات، ئەویش داوای کرد لە بیلال، بۆیە رۆژێك بیلال بانگی فەرموو، خەڵکەکە بە بیستنی ئەو بانگە پێغەمبەر ﷺ خوایان دەهاتەوە بیر، بۆیە دەستیان کرد بە گریان،

گریانێك كە نموونەی وا نەبینرابوو شار ئاوا بەجارێك گریان دایبگرێت.

گیرابوونی نزای سەعد لای هەموان روون بوو، بۆیە هەموان دەترسان لە نزاكانی سەعد، جارێك سەعد كەنیزەكێكی هەبوو جلێكی تازەی پۆشیبوو، رەشەبا هات و جلەكانی كەنیزەكەكەی بەزر كردەوەو جەستەی دەركەوت، عومەری كوڕی خەتاب كە بینی بە گۆچانەكەی دەستی دای لە كەنیزەكەكە، سەعد هات تا رێ لە عومەر بگرێت كەچی عومەر بە گۆچانەكەی دای لە سەعدیش، سەعد كەوتە نزاكردن لە عومەر، عومەر خێرا گۆچانەكەی دەستی دایە دەست سەعد و وتی تۆڵەی خۆت بكەرەوە، سەعدیش لێی خۆش بوو.

جارێك تەمیم دوای نوێژی عەسر نوێژی دەكرد، عومەر بە دارەكەی دەستی دای بەسەر سەریدا، تەمیم وتی ئەی عومەر لەسەر نوێژێك لێم دەدەیت كە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ كردوومە؟ عومەریش وتی ئەی تەمیم هەموو خەڵك ئەوە نازانن كە تۆ دەیزانیت.

کاتێك عومەری کوڕی خەتاب قودامەی کوڕی مەظعوونی کرد بە والی بەحرەین، قودامە بە جوانی کارەکانی خۆی دەکرد و سکاڵآی لەسەر نەبوو ئەوەندە نەبێت کە ئامادەی نوێژی جەماعەت نەدەبوو، ئەوەبوو جاروود کە ئەوکات گەورەی عەبدولقەیس بوو هات بۆ لای عومەری کوڕی خەططاب وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران قودامە مەی خواردوەتەوەو منیش حەددێك لە حەددەکانی خوا دەبینم کە پێویستە لەسەرم بیگەیەنم بە تۆ، عومەر وتی کێ شایەتی دەدات لەسەر ئەوە، جاروود وتی ئەبوهورەیرە شایەتی ئەوە دەدات، عومەریش نامەی نووسی بۆ قودامەو داوای کرد بێت بۆ لای، جاروود قسەی دەکرد بۆ عومەر و دەیوت پەیامی خوا لەم مەسەلەدا بەجێبگەیەنە، عومەریش پێی وت تۆ لەم مەسەلەدا شاهیدیت یان نەیاریت (لایەنی کێشەکە) جاروود وتی من شاهیدم، عومەر وتی دەی تۆ شایەتی خۆتت بەجێگەیاند، بۆیە جاروود بێدەنگ بوو، بەیانی هەمدی هاتەوە بۆ لای و بە عومەری وت حەددی خوا لەسەر ئەم کەسە جێبەجێ بکە، عومەریش وتی هەرچی سەیرت دەکەم تۆ نەیارو سکاڵآ کاریت، تەنها

یەك كەسیش هەیە شاهیدی لەسەر بدات، سوێند بەخوا یان زمانی خۆت رادەگریت یان توندیت لەڕوودا دەنوێنم، جارووودیش وتی سوێند بەخوا ئەوە حەق نیە ئامۆزاكەت مەی بخواتەوەو تۆش توندی بەرامبەر من بنوێنیت، ئەوەبوو عومەر لێی توورە بوو و ماوەیەك بە بەندی هێشتیەوە.

جەریر دەڵێت جارێك لەگەڵ عومەری كوڕی خەتاب و ژمارەیەك لە موسڵمانان‌دا بووین، كەسێكیان بایەكی لێ بوویەوە، عومەر وتی ئێستا پێی دەڵێم بڕوات دەستنوێژ بگرێت، جەریر وتی بەڵكو فەرمان بكە با هەمووومان دەستنوێژ بگرین، ئەوەبوو عومەر وتی دەبێت خۆم و هەموویشتان دەستنوێژ بگرین، ئەوەبوو هەستاین دەستنوێژمان گرت و نوێژمان كرد، عومەریش بە جەریری دەفەرموو (رەحمەتی خوات لێ بێت لە سەردەمی نەفامیدا گەورەیەكی زۆر چاك بوویت، لە سەردەمی ئیسلامیشدا گەورەیەكی زۆر چاك بویت).

جارێك حەسسان لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ شیعری دەهۆنیەوە، عومەر دای بە لایدا و رێگری لێکرد کە بۆچی لە مزگەوتدا شیعر دەهۆنێتەوە، ئەویش وتی من لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ شیعرم دەهۆنیەوەو کەسی لە تۆ باشتریشی تێدا بوو (مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو)، عومەریش وتی راست دەکەیت.

میسوەری کوڕی مەخرەمە دەڵێت جارێك لەگەڵ عومەر بۆ حەج دەچووین رێمان دەکرد کە یەکێك لەسەر رێگە هاواری کرد راوەستن، ئێمەش راوەستاین، کابرا وتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناوتاندایە؟ عومەر وتی ئاگات لە خۆتە چی دەڵێیت؟ ئەو وەفاتی کردووە، کابرا ویستی بڕوات، لایەکی کردەوەو وتی دوای ئەو کێ هاتە شوێنی؟ وتی ئەبووبەکر، کابرا وتی ئێستا لەناوتاندایە؟ عومەر وتی مردووە، کابرا ویستی بڕوات و پشتی هەڵکرد، لایەکی کردەوەو وتی دوای ئەو کێ چووەتە شوێنی؟ وتی عومەر، کابرا وتی ئێستا لەگەڵتانە؟ عومەر وتی ئەمەیە کە قسەت لەگەڵ دەکات، کابرا وتی دەی فریام کەوە، عومەر

وتی تۆ کێیت؟ وتی من حەنەشی کوڕی عەقیلم، لە ڕێی بەنی جوعال گەیشتم بە پێغەمبەر ﷺ و ئەویش بانگهێشتی کردم بۆ ئیسلام و منیش موسڵمان بووم، ئینجا بڕێ ئاوی پێدام تا بیخۆمەوە، تا ئێستاش ئەو ئاوە نەبڕاوەو برسیم بێ تێرم دەکات و تینوویش بم تینوێتیم ناهێڵێت، دە ساڵە من و ژن و منالم وا دەژین و لە شوێنی خۆمم ڕۆژانە پێنج جار نوێژ دەکەم و ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرم و لە دەی زیلحەججەدا قوربانی دەکەم، پێغەمبەر ﷺ وا فێری کردم، بەڵام ئەمساڵ پەکم کەوتووەو ئاوەکەم نەماوە، عومەر وتی فریات دەکەوم، بمبە بۆ سەر ئاوەکە، میسوەر دەڵێت ئینجا چووین و دواتر کە هاتینەوە پرسیارمان کرد لە خاوەن ئاوەکە ئەرێ حەنەش چی دەکات، ئەویش وتی مردووەو ئەوە گۆڕەکەیەتی، عومەر سۆزی بۆی جوولاَ و نزای خێر و داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد.

عومەری کوڕی خەتاب پرسیاری لە حوذەیفە دەکرد دەیوت ئەرێ لەنێو کاربەدەستەکانمدا کەسی دووڕوو هەیە؟ ئەویش دەیوت بەڵێ

یەکێك هەیە؟ عومەر وتی کێیە؟ حوذەیفە وتی پێت ناڵێم، ئەوەبوو دواتر عومەر ئەو کەسەی لابرد، حوذەیفە دەیوت دەتوت عومەر زانیویەتی دووڕووەکە ئەو کەسەیە.

هەروەها کاتێك لە سەردەمی عومەردا کەسێك دەمرد عومەر دەوەستا تا بزانێت حوذەیفە ئامادەیە نوێژی لەسەر بکات، ئەگەر ئامادە بوایە ئەویش نوێژی لەسەر ئەکرد، ئەگەریش ئامادە نەبوایە عومەریش نوێژی لەسەر نەدەکرد نەبادا دووڕوو بێت و ئەو نوێژی لەسەر بکات.

حوذەیفە لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا والی مەدائین بوو، عومەری کوڕی خەتاب ئەوی کرد بە والی مەدائین، حوذەیفە بەڵێنی خۆی خوێندەوە بۆیان، ئینجا خەڵکەکە وتیان چیت دەوێت داوای بکە، ئەویش وتی تەنها خواردنێ بۆ خۆم و ئالیکێ بۆ گوێدرێژەکەمم دەوێت تا لەنێوتاندا بم، ئەوەبوو ماوەیەکی زۆر لەوێ بوو، ئینجا عومەر نامەی بۆ نارد وەرەوە، ئەوەبوو ئەویش گەڕایەوە، کاتێك عومەر بیستی دەگەڕێتەوە لەسەر ڕێ بە نهێنی دانیشت تا بیبینێت، بینی چۆن

چووبوو هەر وا گەڕابوویەوە، لەسەر گوێدرێژەکەی بوو و پارچە نانێکیشی بە دەستەوە بوو و قاچەکانی شۆڕ کردبوونەوە، ئەوەبوو عومەر چوو و باوەشی پیا کرد و وتی تۆ برای منیت و منیش برای تۆم.

جارێك سەلمان لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەمەبۆڵەیەکی بوو، سەعد وتی ئەی سەلمان ئادەی رەچەڵەکی خۆتم بۆ بڵێ، سەلمان وتی من باوکێکم نیە لە ئیسلامدا بووبێت، من سەلمانی کوڕی ئیسلامم، ئینجا ئەو قسەیە گەیشتەوە دەمی عومەر، دوای ماوەیەك عومەر رێی کەوتە سەعد، وتی ئەی سەعد ئادەی رەچەڵەکی خۆتم بۆ بڵێ، خێرا سەعد زانی عومەر بەسەرهاتەکەی بیستووەتەوە، بۆیە وتی توخوا ئەی ئەمیری باوەڕداران وازم لێ بهێنە، ئەویش وتی هەر دەبێت بیڵێیت، سەعد رەچەڵەکی خۆی وت، عومەر وتی قورەیش دەزانن خەططاب شکۆدارترینیان بوو لە سەردەمی نەفامیدا، دەی من عومەری کوڕی ئیسلامم برای سەلمانی کوڕی ئیسلامم، بەخوا ئەگەر لەبەر شتێك نەبوایە سزام دەدایت.

## دەرکردنی جوولەکەکان:

یەکێك لە کارەکانی عومەری کوڕی خەتاب دەرکردنی جوولەکەکان بوو لە خاکی حیجاز، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ لە غەزای خەیبەردا کە سەرکەوت، ویستی جوولەکەکان لە خاکی حیجاز دەربکات، بەڵام ئەوان داوایان کرد دەریان نەکات لە بەرامبەردا نیوەی بەرهەمەکەیان دەدەن بە موسڵمانان، پێغەمبەر ﷺ رازی بوو و فەرمووی (لێرە دەتانهێڵینەوە تا هەر کاتێك بمانەوێت)، ئەوەبوو عومەر لە خیلافەتەکەیدا ئەو جوولەکانەی دەرکرد بۆ ناوچەی تەیما و ئەیحا.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێش وەفاتیدا و لە کاتی سەرەمەرگیدا فەرمووی (جوولەکەی حیجاز و نەجران دەربکەن).

## عومەر ئاوات بە مەرگ دەخوازێت

عومەری کوڕی خەتاب لە کۆتا حەجیدا-لەساڵی ٢٣ کۆچی- نزایەکی کرد ە تاسەی مەرگی تێدا بوو، دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو وتی: خوایە، تەمەنم زۆرەو توانام کەمی کردووەو ناوچەی دەسەڵآتم فراوان بووە، دەی خوایە تا نەفەوتاوم بمبەرەوە بۆ لای خۆت.

هەروەها عومەر نزای دەکرد(خوایە شەهیدیەکم پێ ببەخشە کە لەرێیی تۆدا بێت، مەرگیشم بخەرە ناو شارەکەی پێغەمبەرەکەتەوە ﷺ ).

ئەم کارەی عومەر شتێکی نامۆ نەبووە لەناو هاوەڵاندا، بەڵکو هاوەڵانێك کە ترساون لەوەی تووشی فیتنە بن نزای مەرگیان کردووە، بۆ نموونە:

حەسەنی کوڕی ئەبیلحەسەنی بەصری دەڵێت حەکەمی کوڕی عەمر- کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو- کە نزای مەرگی کرد وتی ئەی تاعوون وەرە بمبە بۆ لای خۆت، کەسێك پێی وت باشە تۆ چۆن وا دەڵێیت

لەکاتێکدا بیستووتە لە پێغەمبەر ﷺ کە دەیفەرموو (کەستان لەبەر خراپەو زیانێك کە تووشی دەبێت ئاوات بە مەرگ نەخوازێت)، حەکەم وتی بەڵێ من ئەو فەرموودەم بیستووە، بەڵام دەمەوێت پێش شەش شت بکەوم و نەگەم بەوانەو پێش ئەوانە بمرم: فرۆشتنی دادوەری...

هەرچەندە ذەهەبی بێدەنگ بووە لە حوکمی صەحیحی ئەم فەرموودەیە، بەڵام لەو دەقەی ئیبن حەجەرەوە دەزانین صەحیحە کە دەڵێت رای راستتر ئەوەیە حەکەم نزای مەرگی بۆ خۆی کردووە.

سەبارەت بە حوکمی داواکردنی مەرگ لە شەرحی ئەو فەرموودەدا کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (کەستان لەبەر خراپەو زیانێك کە تووشی دەبێت ئاوات بە مەرگ نەخوازێت) ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم گوتارە بۆ هاوەڵان و موسڵمانانی دواتریشە، سەبارەت بەوەی فەرموویەتی لەبەر زیانێك داوای مەرگ نەکرێت دەستەیەك لە زانایانی پێشین پێیان وایە مەبەستی زیان و نارەحەتی دنیاییە، ئەگەرنا ئەگەر بینی زیانەکە بۆ

ئاخیرەتی بوو و ترسا دینەکەی تووشی فیتنە بێت ئەوە رێگری نەکراوە لە داوای مەرگ، دەستەیەك لە هاوەڵانیش ئەوەیان کردووەو –لە ترسی زیانی ئاخیرەت- داوای مەرگیان کردووە، وەك لە مەوطائدا هاتووە عومەر داوای مەرگی کردووەو وتوویەتی خوایە تەمەنم زۆر بووەو توانام کەمی کردووەو هاوڵاتیانیشم بڵاوبوونەتەوە، دەی بمبەرەوە بۆ لای خۆت،...سەبارەت بەوەش کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ئەگەر هەرکامتان هەر ناچار بوو –ئاوات بە مەرگ بخوازێت- با بڵێت خوایە بممرێنە ئەگەر مەرگ خێرە بۆم) ئەوە ئاماژەیە بەوەی ئەو شێوە داواکردنە رێگری لێنەکراوەو راستەوخۆ داواکردنی مەرگ نیشاندانی جۆرێك لە نارەزایەتیە.

## کۆتا ڕۆژان و برینداربوونی عومەر

عەمری کوڕی مەیموون دەڵێت چەند ڕۆژێك پێش ئەوەی عومەر بریندار بکرێت، من عومەرم بینی کە لەگەڵ حوذەیفەی کوڕی یەمان و عوثمانی کوڕی حونەیفدا وەستابوو، سەبارەت بە کاروباری وڵات قسەیان دەکرد، دواتر عومەر وتی خوا سەلامەت بمهێڵێت بێوەژنانی عێراق وا لێدەکەم دوای من پێویستیان بە هیچ پیاوێ نەبێت، دوای چوار ڕۆژی تر بریندار کرا، من ئەوکات لە نزیکیەوە بووم، تەنها عەبدوڵای کوڕی عەبباس لە نێوانماندا بوو، نوێژی بەیانی بوو، بە نێو ڕیزەکاندا دەگەڕاو دەیوت ڕێك ڕاوەستن، تا هیچ لارو وێریەکی بەدی نەدەکرد ئینجا دەگەڕایەوە شوێنی خۆی، دوای ئەوە چوویە پێشەوەو نوێژی دابەست و وابزانم لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی یووسف یان سوورەتی نەحلی خوێند، تا ئەوەی خەڵکی هاتن، هێندەی نەبرد گوێم لێ بوو هاواری کرد سەگەکە کوشتمی-یان سەگەکە خواردمی- کابرای بێزراو بە چەقۆیەکی دووسەرەوە بۆی هەڵهات و بە ڕاست و

چەپدا خەڵکەکەی دەپێکا تا ئەوەی سیانزە هاوەڵی برینداار کرد و حەوت لەوانەش مردن، یەکێك لە موسڵمانان شتێکی دا بەسەریدا و کابراش کە زانی تازە گیراوە خۆی سەربڕی، عومەر دەستی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی گرت و خستیە پێشەوە تا نوێژەکە بکات بۆ خەڵکەکە، ئەوانەی لە نزیك عومەرەوە بوون زانییان چی ڕوویداوە، بەڵام ئەوانەی دواوە نەیاندەزانی چی بووە، عەبدوڕەحمان نوێژێکی کورتی کرد بۆیان، دواتر عومەر بە ئیبن عەبباسی وت بزانە کێ منی کوشت؟ ئەویش وتی پیشەسازەکە-کە خزمەتکاری موغیرەی کوڕی شوعبە بوو، عومەر وتی خوا بیکوژێت خۆ من چاکەی زۆرم لەگەڵ نواند، سوپاس بۆ خوا کە مەرگمی بە دەستی کەسێك دانەنا کە بانگەشەی موسڵمانێتی بکات، ئینجا عومەر برایەوە بۆماڵەوەو ئێمەش لەگەڵی چووینە ماڵەوە، هەندێ دەیانوت چاك دەبێتەوە، هەندێ دەیانوت دەترسین بمرێت، ئینجا بڕێ شەربەت هێنرا تا بیخواتەوە، شەربەتەکەی خواردەوە خێرا هاتە دەرەوە، ئینجا شیری بۆ هێنرا، لە شوێنی برینەکەیەوە هاتە دەرەوە، ئیتر زانییان عومەر نامێنێت،

خەڵکەکە دەهاتن بۆ لای و دڵخۆشییان دەدایەوە، ئینجا عومەر وتی بزانن چەندە قەرزارم، حسابیان کرد نزیکەی هەشتاو شەش هەزار قەرزار بوو، ئەویش وتی ئەگەر سامانەکەم بەشی کرد قەرزەکانم بدەنەوە، ئەگەرنا داوا بکەن لە بەنی عەددی-هۆزەکەم- تا قەرزەکەم بدەنەوە، ئەگەر بەوەش تەواو نەبوو ئەوە داوا بکەن لە قورەیش و لەوە زیاتر داوا لە کەسی تر مەکەن.

## دیاریکردنی جێنشین

لە کۆتا حەجی عومەر عەبدوڕەحمانیش بەشدار بوو، بیستی کەسێك دەیوت ئەگەر عومەر مرد من بەیعەت بە فلآنە کەس دەدەم، عەبدوڕەحمانیش بە خەلیفەی وت چی ڕوویداوە، عومەر وتی دوای عەسر پشت بەخوا ڕوونکردنەوە دەدەم بەو خەڵکە، عەبدوڕەحمان وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە مەکە، چونکە ئێستا هەمەچەشنە خەڵك هاتون و لەوانەیە قسەیەك بکەیت کە وەك خۆی وەرینەگرن، بەڵام کە چوویتەوە مەدینە قسەی خۆت بکە، عومەریش ڕاکەی عەبدوڕەحمانی وەرگرت.

لەو نوێژەدا کە عومەر پێکرا، خێرا فەرمانی کرد عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف نوێژەکەی بۆ خەڵکەکە کرد، پاشان عەبدوڕەحمانی بانگ کرد و وتی دەمەوێت تۆ ڕاسپێرم بۆ باری دەسەلآتی دوای خۆم، عەبدوڕەحمان ڕازی نەبوو، عومەر وتی دەی ئەم ماوە بێدەنگ بە تا ئەو کەسانە ڕاسپێرم کە پێغەمبەر ﷺ تا وەفاتی کرد لێیان ڕازی بوو.

عومەر پاش ئەوەی پێکرا، شەش کەسی راسپارد تا لەنێو خۆیاندا کەسێك دیاری بکەن بۆ خیلافەت، ئەوانیش بریتی بوون لە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، عوثمانی کوڕی عەففان، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا، زوبەیری کوڕی عەووام، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف.

عومەر ئەگەری دانا بۆ درووستبوونی راجیایی لەسەر دیاریکردنی کەسێك و چارەسەری بۆ داناو وتی ئەگەر سێ کەس سێ کەس کەوتن (واتە بوون بە دوو بەشەوە) ئەوە عەبدوڵای کوڕی عومەر بکەن بە دادوەری نێوانیان، ئەگەریش بە دادوەری ئەو رازی نەبوون، ئەوە لەگەڵ ئەو دەستەیە بن کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی تێدایە.

ئەوەبوو دواجار سیانیان وازیان هێنا لە مافەکەیان بۆ ئەوانی تر، مانەوە سەر عەبدوڕەحمان و عەلی و عوثمان، عەبدوڕەحمان وتی منیش لەپێناو خوادا واز لە مافەکەم دێنم و ئێوەش یەکێکتان وازبهێنن تا بەیعەت بدەین بەوی تر، دواجار ئەهلی شوورا بڕیاری کۆتاییان دایە

دەست عەبدوڕەحمان، ئەویش کەوتە وەرگرتنی رای خەڵکی و تەنانەت رای ژن و منداڵیشی وەرگرت، رای سوارەو پیادەکانیشی وەرگرت، سێ شەو و رۆژ بەردەوام بوو لەو راوەرگرتنەی، رای زۆرینەی هەرەزۆر لەسەر عوثمانی کوڕی عەففان بوو، دواجار لەبەری بەیاندا مێزەرەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ کردە سەر و ناردی بە شوێن ناودارانی ناو کۆچەران و پشتیوانان و خەڵکی ترداو مزگەوت پڕ بوو لە خەڵك، چوویە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ و ماوەیەکی زۆر وەستا و بە دەنگی نزم نزایەکی زۆری کرد، دواتر خەڵکەکەی دواند، ئینجا عەلی بانگ کرد و دەستی گرت و وتی لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ و کرداری ئەبوبەکر و عومەر بەیعەتم پێدەدەیت؟ وتی ناوەڵآ، بەڵکو هێندەی توانام هەبێت، عەبدوڕەحمان دەستی بەردا و عوثمانی بانگ کرد و دەستی گرت و هەمان شتی بەویش وت، عوثمان وتی بەڵێ بەخوا، ئەوەبوو عەبدوڕەحمان لە شوێنەکەی پێغەمبەر ﷺ دانیشت و عوثمانیش لە پلیکانەی خوارترەوەو

خەڵکەکە هاتن بەیعەتیان دا بە عوثمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبووطالیبیش بەیعەتی پێدا.

جا بڕێك دەق هاتون کە عەلی کوڕی ئەبووطالیب بەو بڕیارە ناڕازی بوو‌بێت و ئەوەی بە فێڵ دانابێت، ئیبن کەثیر دەڵێت: (ئەوەی زۆرێك لە مێژوونووسانی وەك ئیبن جەریر و کەسانێکی تر لە بڕێك کەسی نەناسراوەوە تۆماریان کردووە گوایە عەلی بە عەبدورەحمانی وتووە تۆ منت خەڵەتاند و تۆ لەبەر خزمایەتی و لەپێناو ئەوە عوثمانت دانا تا لە هەموو شتێکدا رات وەربگرێت و...هەموو ئەمانە پێچەوانەی تۆماری صەحیح و دروستن و دەدرێنەوە بە رووی خاوەنەکانیاندا).

کاتێك عومەر پێکرا، بڕیاری دا مەسەلەی خیلافەت بە شوورا بێت، ئەو دەیوت ئەگەر بمویستایە کەسێك رابسپێرم ئەوە زیاتر حەزم دەکرد زوبەیری کوڕی عەوام بێت، چونکە ئەو پایەیەکی دینە.

## شەهیدکردنی عومەر

کاتێك عومەری کوڕی خەتاب پێکرا، بە عەبدوڵای کوڕی وت بڕۆ بزانە کێ منی کوشت؟ ئەویش وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەبوولوئلوئەی کۆیلەی موغیرەی کوڕی شوعبە تۆی کوشت، عومەریش وتی سوپاس بۆ خوا کە مەرگی منی بە دەستی کەسێك نەهێنا کە تاکە سوجدەیەکیشی بردبێت بۆ خوا، ئەی عەبدوڵا بڕۆ بۆ لای عائیشەو پرسیاری لێ بکە بزانە مۆڵەت دەدات لەلای پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکر ئەسپەردە بکرێم؟

عەمری کوڕی مەیموون دەڵێت ئامادە بووم کاتێك عومەر بە عەبدوڵای کوڕی وت بڕۆ بۆ لای دایکی باوەڕداران عائیشەو بڵێ عومەر سەلامت لێ دەکات، دواترپر سیاری لێ بکە بزانە مۆڵەت دەدات لای پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکر ئەسپەردە بکرێم؟ عائیشەش وتی من ئەوەم بۆ خۆم دانابوو، بەڵام ئەمڕۆ لە خۆم دەگوزەرم بۆ عومەر، کە عەبدوڵا هاتەوە عومەر وتی چیت کرد؟ ئەویش وتی

مۆڵەتی دا، عومەر وتی هیچ شتێ هێندەی ئەو شوێنە لام گرنگ نیە، جا کە مردم بمبەن بۆ ئەوێ و دواتر سەلام بکەن، دواتر هەمدی بڵێ عومەری کوڕی خەتاب داوای مۆڵەت دەکات، ئەگەر عائیشە هەمدی مۆڵەتی دا ئەوکات ئەسپەردەم بکەن، ئەگەریش دەرفەتی نەدا بمگێڕنەوەو بمبەن بۆ گۆڕستانی موسڵمانان، دواتر وتی بۆ خیلافەت شیاوترین کەس ئەوانەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ تا وەفاتی کرد لێیان ڕازی بوو، جا هەرکەسیان دیاری کرد دوای من ئەوە خەلیفەتانەو گوێڕایەڵی بن... وەسیەت بۆ خەلیفەی دوای خۆم دەکەم یەکەمجار لەگەڵ کۆچەریە یەکەمینەکاندا چاك بێت و مافیان بزانێت و شکۆیان بپارێزێت، دواتر لەگەڵ پشتیوانان چاك بێت چونکە ئەوا پەنادەر بوون، با چاکەی چاکەکاریان قبوڵ بکات و لەوەشیان خۆش بێت خراپەیەك دەکات. کاتێك عومەر لە سەرەمەرگیدا بوو، سەری لە کۆشی عەبدوڵای کوڕیدا بوو، وتی ئەی عەبدوڵا سەرم بخەرە سەر خۆڵەکە بەڵکو خوای گەورە بەو بارەوە بمبینێت و ڕەحمم پێ بکات.

لە ڕۆژی یەکشەممەی ساڵی بیست و چواری کۆچیدا عومەری کوڕی خەططاب کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی ئەسپەردە کرا.

کاتێك عومەری کوڕی خەتاب وەفاتی کرد، سەعیدی زاوای زۆر گریا، پێیان وت بۆچی دەگریت؟ وتی بۆ ئیسلام دەگریم، گورزێکی بەرکەوتووە تا ڕۆژی دوایی شوێنەواری دەمێنێت.

کاتێك عومەری کوڕی خەتاب کۆچی دوایی کرد، هەریەك لە سەعید و عوثمانی کوڕی عەففان و صوهەیب و ئیبن عومەر دابەزینە ناو گۆڕەکەیەوە. کاتێك عومەری کوڕی خەططاب وەفاتی کرد، خەڵکێ نزایان دەکرد بۆ عومەر، عەلی کوڕی ئەبووطالیبیش وتی ڕەحمەتی خوات لێ بێت، هیوام وایە خوای گەورە لەگەڵ دوو هاوڕێکەت کۆت بکاتەوە-پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکر- چونکە من زۆر جار لە پێغەمبەری خوام ﷺ دەبیست دەیفەرموو من و ئەبووبەکر و عومەر بووین، من و ئەبووبەکر و عومەر وامانکرد، من و ئەبووبەکر و عومەر چووین.

سەبارەت بە کاتی شەهیدبوونەکەی دەوترێت لە رۆژ شەممە لە سەرەتای مانگی موحەرەمی ساڵی بیست و چواری کۆچیدا بووە، دەشوترێت سێ رۆژ پێشتر پێکراوەو دوای سێ رۆژ وەفاتی کردووە، سەبارەت بە تەمەنەکەشی لەکاتی شەهیدبوونیدا هەریەك لە پەنجاو دوو و پەنجا و چوار و پەنجاو پێنج و شەست و سێ ساڵی هاتووە، واقیدی دەڵێت راستتر لای ئێمە ئەوەیە کە لە تەمەنی شەست ساڵیدا بووە،

ماوەی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتاب دە ساڵ و حەوت مانگ و پێنج رۆژ بوو، یان دەوترێت دە ساڵ و هەشت مانگ و چوار رۆژ بوو، ئەگەر بەپێی ئەو گێڕانەوەی لەدایکبوونەی بێت کە سی و چوار ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لەدایك بووە، ئەوە لە کاتی شەهیدبوونیدا تەمەنی حەفتاو یەك ساڵان بووە، ئەگەریش بەپێی ئەوە بێت سیانزە ساڵ پاش ساڵی فیل لەدایك بووبێت ئەوە لەکاتی وەفاتیدا تەمەنی شەست و چوار ساڵان بووە.

## چەند فەرموودەیەك کە عومەر دەیانگێڕێتەوە:

عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (إنما الأعمال بالنيات ، وإنما لكل امرئ ما نوى ، فمن كانت هجرته إلى دنيا يصيبها ، أو إلى امرأة ينكحها ، فهجرته إلى ما هاجر إليه) (هەموو کردارێك بە نیەتە، هەر کەسیش نیەتەکەی بۆ حیسابە، جا هەرکەس کۆچکردنی بۆ دنیا بێت تا بە دەستی بهێنێت یان ئافرەتێك بە هاوسەر بگرێت، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردووە).

عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لە سەردەمی نەفامیدا نەزرم کردبوو شەوێك لە مەسجیدولحەرام ئیعتیکاف بکەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (نەزرەکەت بەجێ بگەیەنەو شەوێك ئیعتیکاف بکە).

## کۆتایی

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەستەی هەڵبژێردراو بوون بۆ وەرگرتنی پەیامی الله تعالی و بەجێگەیاندنی لەبەردەستی سەروەرماندا و ئەزموونکردنی لە دوای وەفاتی خۆشەویستمان، لەوەشدا نموونەی باڵا بوون و توانییان الله لە خۆیان ڕازیی بکەن و دەقەکانی قورئان و فەرموودە ئەستۆپاکییان بسەلمێنن.

جێی سەرنج بوو بۆم کەسانێك کە توانیبێتیان الله تعالی لە خۆیان ڕازیی بکەن، بتوانن کۆتا پەیام لە کۆتا پێغەمبەرەوە ﷺ وەربگرن و بە ئەمانەتەوە بیگەیەنن بە مرۆڤایەتی و ئەمڕۆ ئێمە لەسەر بنەمای ئەو هەنگاوەی ئەوان سەرقاڵی دینداریی بین، دەکرێت چەند وانەیەکیان لێوە فێر ببین بۆ ژیانمان، بەڵکو ئێمەش بتوانین وەك ئەوان الله لە خۆمان ڕازیی بکەین و خزمەتێك بە نەوەی دوای خۆیشمان بکەین.

ئێمە بە دەقی قورئان ڕێنمایی کراوین پێشەنگیی بکەین بە پێغەمبەرانی خواوە ﷺ، وەك لە قورئاندا هاتووە (فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهِ)، هەروەها ڕێنمایی کراوین پێشەنگی بە کۆتا پێغەمبەرەوە بکەین ﷺ (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ)، هاوەڵان یەکەم نموونە بوون کە توانییان ئەم پێشەنگییانە جێبەجێ بکەن و خوای گەورەش شایەتییان بۆ بدات و لێیان ڕازیی بێت، واتە براوە بون، دەبێت ئێمەش پێشەنگیمان بە هاوەڵانەوە هەبێت و لە شێوازی ژیان و هەڵسوکەوتیان وردببینەوە، بزانین چۆن توانییان پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ درێژە بە پەیامەکە بدەن و دینی الله تعالی بگەیەنن بە سەرجەمی مرۆڤایەتیی؟ ئاکار و ڕەفتاریان چۆن بوو؟

ئەگەر بتوانین لە ژیانی هاوەڵان و هۆکاری بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا لەلایەن ئەوانەوە بکۆڵینەوەو بگەینە ئەنجام، پاشان هەمان ڕێڕەو لە ژیانماندا بگرینەبەر، پشتیوان بە الله تعالی ئێمەش دەتوانین بگەین بە ڕەزامەندیی پەروەردگار.

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.



# سەرچاوە

[١] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٢٤٥.

[٢] - الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٤٤٧.

[٣] - المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٤٠٧٤.

[٤] - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٣، ص ٤٦١.

[٥] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٤٧.

[٦] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٤٧.

[٧] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٤.

[٨] - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٢، ص ٤٤٧.

[٩] - صحيح البخاري، الرقم ١٣٣٩.

[١٠] - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٢، ص ٤٤٨.

[١١] - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٤٤.

[١٢] - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٧٢.

[١٣] - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٦٨.

[١٤] - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٩٥، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٠٦، سنن ابن ماجة، الرقم ٩٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٨٤٧،

[١٥] - تاريخ مدينة دمشق، ج٤٤، ص ١٤.

[١٦] - تاريخ مدينة دمشق، ج٤٤، ص ١٣.

[١٧] -صحيح البخاري، الرقم ١، صحيح مسلم، الرقم ٣٦٢١، صحيح ابن خزيمة، الرقم ١٤٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٩٠، ١٦١٤، السنن

[١٨] -صحيح البخاري، الرقم ١٩٥٤.